

ژ وەشانێن پەرتوکخانا فەرهەنگ

Pertukxana Ferheng

# ئۆلیڤەر تویست

چارلس دیکنز

وەرگێڕان

روژهات سەعید

چارلس دیكنز

ئولیڤەر تویست

وەرگێڕان : ڕوژهات سەعید

# چارلس دیكنز

# ئولیڤەر تویست

**The Adventures of Oliver Twist(1839)**

وەرگێران : روژهات سەعید
ژمارا سپاردنێ: ٢٦١٤ پەرتوكخانا بەدرخانیا - دهوك
بەرگ: زێرەڤان سەعید
كومپیوتەر: نێچیرڤان سەعید
چاپخانا: كوردستان - زاخو
چاپا ئێكێ: 2011

وەشانێن پەرتوكخانا فەرهەنگ ل زاخو
Korek:0750 325 42 22
Pertukxana_ferheng@yahoo.fr

# چارلس دیکنز



**نڤێسەرێ ئنگلیز ، ل روژا 7/2/ 1812 ێ ل باژێرێ پورتثموث ل ئینگلتەر ژ دایك بوویە ، ل سالا 1837 ێ ئێکەمین رومانا خو ب ناڤێ لاپەرێن بیکویکی چاپکر ، ل سالا 1840 چوو ئەمریکا ، و ل ڤێرێ گوڤارێن دەیلی نیوس و هاوسهولد دەرئێخستن ، ل نەهی خەزیرانا 1870 ێ ل کێنت ئینگلتەرە گیانێ خو ژ دەست دا ، و ل لەندەن هاتە ڤەشارتن . رومانێن چارلس دیکنسی :**

- The Posthumous Papers of the Pickwick Club (1837)
- The Adventures of Oliver Twist(1839)
- The Life and Adventures of Nicholas Nickleby (1839)
- The Old Curiosity Shop (1841)
- A Christmas Carol (1843)
- David Copperfield (1849)
- Bleak House (1853)
- Hard Times: For These Times (1854)
- A Tale of Two Cities (1859)
- Great Expectations (1861)
- The Mystery of Edwin Drood (1870)

## گوتنەکا پێدڤی

سەرهاتییێن ئولیڤەر تویستی پتر ژ (150) سالە ژ لایێ حەژێکەرێن رومانا ڤە دهێتە خواندن، ل سالا 1839 ێ دەمێ ژیێ چارلس دیکنزی (27) سال ئەڤ رومانە نڤیسیە ، ب گەلەك زمانێن دی ل جیهانێ هاتینە وەرگێران ب چاپێن جودا جودا،ئەڤ چاپا ل بەر دەستێ هەوە ژی کو ب شێوەیەکێ سادە و ساناهی هاتیە نڤێسین هاتیە وەرگێران بو زمانێ مە، رومانەکا فەر بوو بهێتە وەرگێران هێڤییە ببیتە پێنگاڤەکا بچویك بو وەرگێرانا کلاسیکێن جیهانی .



ب فەر دبینم سوپاسیا وەشانێن بیلگی بکەم، ل ئیستانبولێ ژ بو دەستویردانا وان بو ،وەرگێرانا ڤێ ڕومانێ......

# پشكا ئێكێ

## زاروكینیا ئولیڤەر تویستی

د ناڤ هندەك ئاڤاهیێن باژێری دا، خانیەك بو هەژارا هاتبوو تەرخان كرن، كەس‌انێن هەژار و بێ مال ل وێرێ دژیان ، دگوتنە ڤێرێ ((مالا بێ هێزا ))، ئولیڤەر تویست ل وێرێ ژ دایك ببوو، دەیكا وی یا گەنج، نەخوش بوو ل سەر تەختێ خو، نوژدارەك و خانمەكا پیر ل هنداڤ بوون، دەیكا گەنج گوت " بهێلن دا زاروكێ خو ببینم، پاش بمرم "
دكتوری گوت " نوكە بەحسێ مرنێ نەكە "
خانما پیر گوت " نەخێر، هێشتا زوی یە بو مرنێ "
دەیكا گەنج، سەرێ خو هەژاند و دەست كر زاروكێ خو . نوژداری زاروك كرە د دەستێن وێ دا، دەیكا وی ب لێڤێن خو یێن سار و بێ رەنگ زاروكێ خو ماچێ كر، پاش كەفت و مر، نوژداری گوت "مر " . خانما پیر گوت "ئەرێ، ژارێ "، زاروك ژ دەستان دا ئینا دەر .
نوژداری دەمێ كومك و دەستگورك كرینە دەستێ خو، گوت " كچەكا جوان بوو "، ژ كیڤە هاتبوو ؟"
شەڤێدی ئەو ئینا ڤێرێ، ل جاددەیان دنڤست، ژ رێكەكا دویر هاتبوو، پێلاڤێن وێ قەتیای بوون، كەسێ نە زانی كا دێ كیڤە چیت و ژ كیڤە دهات .
نوژداری دەستێ وێ یێ چەپێ ڕاكر و گوت "چیروكەكا كەڤنە، ئەز چ گوستیركا ل تبلێن وێ نابینم، نە شوی كریە، شەڤ باش "
نوژدار چوو، خانما پیر، جلك كرنە بەر زاروكێ بێ خودان، جل و بەرگێن كەڤن و دڕیای، ئولیڤەر پاش هاتە ڤرێكرن بو جهەكێ دی تر یێ بیست تا سیهـ زاروكێن بێ خودان لێ هەین .
ژنكەكێ ب ناڤێ مان ئەڤ زاروكە خودان دكرن، هەر حەفتی هندەك پارە ددان ڤێ ژنكێ دا بەرێ خو بدەتە ڤان زاروكا . بەلێ نیڤەكا پتر ژ ڤان پارا ژنكێ بو خو ڕادكرن . ژ بەر هندێ زاروكا كێم خوارن دخوارن . و گەلەك ژ برسا دمرن . ئولیڤەر نەمر، بەلێ هەردەم برسی و لاواز بوو . دەمێ ژییێ وی بووی نەهـ سالی، لگەل دوو هەڤالێن خو گوتن مانێ ئەم برسی نە، مانێ ئەو كرن د ژوورەكا تاری ڤە و ڤوتان . ل دەمێ ئەو ل ژوور كارگێرەكێ مالا هەژارا هاتە دەڤ مانێ . بامبلی گوت، "ئەز یێ هاتیم بو كاری "
ئەو زاروكێ ناڤێ وی ئولیڤەر تویست دێ ئەڤروكە بیتە نەهـ سالی مانە وەیە ؟
بەلێ، زاروكێ خوشتڤی، هەمی زاروك، زاروكێن من یێن خوشتڤی نە .
مە بابێ وی نەدیت و ئەم نزانین كا دەیكا وی ل كیڤە یە ؟
ناڤێ وی كێ كرە ئولیڤەر تویست؟
من .
تە، بەرێز بامبل.
ئەرێ، ب گورەی پیتا ئەم ناڤا لێ دكەین، یێ دویماهیێ پیتا وی (ئێس) بوو، من ناڤێ سڤابیل لێ كر، یێ ڤی (تێ) بوو، من كر تویست، یێ پشتی وی دێ بیتە ئونڤین، بو یێن دی ژی ناڤ ئامادەنە، پاش دێ ب پیتا (ئەی) دەست پێ كەینە ڤە .
تو كەسەكێ باشی بەرێز بامبل .
كەیفا بامبلی ب ڤێ ئاخفتنێ هات .

- دا بەرێ خو بدەینە کارێ خو، ئولیڤەر تویست، ئێدی ل ڤێرێ نامینیت، یێ مەزن بووی، دێ دیسا بەینە مالا بێ هێزا، یێ هاتیم ببەم، دا ببینم، ب دەستوریا هەوە .
- دێ نوکە ئینم .
مانێ تویست ژ ژوورا تاری ڤە ئینا دەر، سەر و چاڤێن وی شویشتن، بو بامبلی بر .
بامبلی پرسیار ژێ کر، "دێ لگەل من هێی، ئولیڤەر ؟"
دا ئولیڤەر بێژیت، دێ کەیفا من هێت ئەز ژ ڤێرێ بچم، رویێ مانێ دیت، مانێ ل پشت بامبلی بەرێ خو ددا ئولیڤەری ب تورەی ڤە . ئولیڤەری زانی کا وێ چ دڤێت ؟
دێ خانم مان ژی لگەل من هێت ؟
نەخێر ناهێت . بەلێ دێ هندەك جارا هێت تە بینیت
هەرچەندە ئولیڤەر زاروك بوو، بەلێ یێ ئاقل بوو تا بشێت خو بگرینیت، دێ ژ خانم مانێ دویر کەڤیت، ژ بەر کو برسی ژی بوو، یا ب زەحمەت نەبوو بگریت . خانم مانێ ئەو گەلەك ماچێ کر، و نانەك ب نیڤشك ڤە داڤێ، دا کو دەمی دچیت مالا بێ هێزا، یێ دیار نەبیت برسی یە .
ب ڤی رەنگی بامبلی ئولیڤەر برە ئەو مالا لێ ژ دایك بووی، ئانکو مالا بێ هێزا، ئولیڤەر تویست ل دەڤ خانم مانێ، ب تنی جارەکی ئاخفتنەکا خوش گوهـ لێ نەببو  و پاریەکێ نانی یێ خوش نەخوار بوو .

## پشکا دووێ

## ئولیڤەری پتر خوارن دڤێت

پشتی بورینا نەهـ دەهـ هەیڤا، ئولیڤەر، ل مالا بێ هێزا ژ بەری نوکە دلنەخوش تر بوو، کار دکر و زێدەتر برسی دبوو. روژێ سێ جارا خوارن دخوار، خوارن ژی شوربەیەکا پیچەك گوشت و هندەك تشتێن دی دی بوون . ل روژێن ئێکشەمبیا هندەك نان ژی دخوار . ئەو جهێ زاروکا خوارن لێ دخوار، هولەکا مەزن بوو، ل سەرێ هولێ قازانەکا مەزن هەبوو . ل دەمێ خوارنێ ئوستایەکێ خوارن ددا زاروکا، و ژنکەك یان دوویا هاریکاریا ئوستای دکر .
ب تنێ ترارەك شوربێ دهاتنە دابەشکرن ل سەر زاروکا، زێدەتر قەدەغە بوو . ترار نە دهاتنە شویشتن . زاروکا ب کەڤچکێن خو ئەو پاقژ دکرن .
ئولیڤەر تویست و هەڤالێن وی شیان سێ هەیڤا ل ژێر ڤێ برساتیێ بژین، روژەکێ زاروکەکێ پیچەکێ ژ وان مەزنتر گوتە وان، ئەگەر ئەز دوو ترارا نەخوم دێ زاروکێ ل تەنشتا من دنڤیت، خوم . زاروکا باوەری پێ ئینا . ژ بەر هندێ بریار دا ئێك ژ وانا بچیتە دەڤ ئوستای دا کو پتر بدەتێ . ئەو زاروك ئولیڤەر تویست بوو . بوو شەڤ و زاروکا خو کرە ریز، خوارن هاتە دابەشکرن . خوارن هەمیا خوارن، و گازی ئولیڤەر تویستی کرن، پالدا بو پێشاهیێ، چوو بەرامبەر ئوستای، گوتێ
ئەزبەنی، هیڤی دکەم پیچەکا دی بدە من .
ئوستا شاش بوو، زاروك ژ ترسا دا دلەرزین .
چ....؟
هیڤی دکەم، پیچەکا دی بدە من .
ئوستای ب کەڤچکێ خو دانا سەرێ ئولیڤەر تویستی، پاش ژ دەستێن وی گرت و گازی هاریکارا کر، هندەك کەس لگەل بامبلی هاتنە ژوور، ئوستای بو وانا بابەت ڤەگێرا . گازی کر :
وی هێشتا ڤیا، هوین تێدگەهن، زێدەتر خوارن ڤیا .
یێن ل وێرێ باوەر نەکر . ئێکی گوت، "دڤێت ئەڤ زاروکە بهێتە خودان کرن، بو سێدارەدانێ"، ئولیڤەر گرت و برە ژوورەکا تاری .
ل سپێدەهیا پاشتر، ئاگەهداریەك هاتە هلاویستن ب مالا بێ هێزا ڤە، د ڤێ ئاگەهداریێ دا هاتبوو دیار کرن یێ ئولیڤەر تویستی ببەت، د پێنچ سەد پاوندا دەنێ .
ئولیڤەر حەفتیەکێ ما د ڤێ ژوورا تاری ڤە، سار بوو، هەر سپێدەهی دهاتە دەرئێخستن دا کو بشون، بامبلی ئەو دقوتا، ل دەمێ خوارنێ ژی ئەو دهاتە قوتان ل بەر چاڤێن زاروکان . ئولیڤەر هەردەم دگری، شەڤ نە دنڤست . کەس نەهات ئولیڤەری ببەت، بامبلی بریار دا، وی ڤرێکەتە گەمیەکێ دا کار بکەت .
ل روژەکێ بامبلی، سوەربێری دیت، سوێربێری تابوت چێدکرن، و تابوتێن وی بو مالا بێ هێزا دهاتنە ڤرێکرن، ئەو هەژارێن ل وێرێ دمرن، سوێربێری گوت بامبلی :
من دوو تابوتێن دروست کرین بو هەردوو ژنکێن شەڤێدی مرین .
ئەز باوەر دکەم، هوین گەلەك پارا ژێ فایدە دکەن .
راست، کێم پارا ددەنە من، بەرێز بامبل .
بەلێ تابوت ژی بچویکن .

سوێربێری کەیفا وی ب ڤێ ئاخفنێ هات و کەنی .
وەیە، وەیە، بەرێز بامبل، خوارنا هوین ددەنە وان ، ئەگەرێ بچویکیا تابوتانن، بەلێ دیسان دار ژی گرانە، و کەسێن قەلەو زوی دمرن، تابووت ژێ کێم قازانجن .
بامبلی گوت "دا ژبیرا من نەچیت، تو ئێکی دنیاسی، زاروکەك بڤێت، ب پێنج سەد پاوندا "، گوپالێ خو راکر، ئاگەهداری نیشا کر،
من ژی دڤیا ئەز ڤی بابەتی لگەل تە ب ئاخڤم، ئەز گەلەك هاریکاریا هەژارا دکەم، نوکە ژی ئەز هزر دکەم، دێ ئەو تشتەکی کەن، من دڤێت ئەز زاروکی وەربگرم .

## پشکا سیێ

## ئولیڤەر دبیتە کرێکار

پشتی دەمەکی، بڕیار هاتە دان ئولیڤەر ل دەڤ سویربێری کار بکەت، بامبلی وێ شەڤێ ئولیڤەر برە دەڤ دکانێ، ئولیڤەر گری، دلنەخوش بوو، دزانی کەس حەز ژ وی ناکەت . سوێربێری دکان گرتبوو، ل بەر شەمالکەکا لاواز تشتەك دنڤیسی .

بەرێز سوێربێری، ئەڤە من زاروك ئینا . ئولیڤەری سلاڤ کرێ .

سوێربێری، دا کو باشتر ئولیڤەر ببینیت، شەمالك ڕاکر، "ئەڤە ئەو زاروك مانە وەیە ؟ خانم سوێربێری بێ زەحمەت وەرە ڤێرێ"، ژ ژوورا بچویك یا ل پشت دکانێ ژنکەکا رویێ وێ وەکی رێڤیا دەرکەفت . "هەڤژینا من، ئەڤە ئەو زاروکێ من بوتە بەحس ژێ کری، ژ مالا بێ هێزا"، ئولیڤەری خو چەماند دا کو سلاڤ بکەتێ .

ئوف، ئەڤە گەلەك بچویکە .

بامبلی بەرێ خو دا ئولیڤەری هەر وەکو، زاروکینیا وی تاوانا وی یە . گوت " ئەرێ پیچەك بچویکە، ئەڤە راستە، بەلێ چەوا بیت دێ مەزن بیت، خانم سوێربێری، دێ هەر مەزن بیت" .

ژنکێ ب تورەی ڤە گوت " دخوازم مەنز ببیت، ب خوارنا مە دێ مەزن بیت"، هەڤژینا سوێربێری گوت "خودان کرنا ڤان زاروکا ب بهایە، دێ هەڕە خوارێ، گینیکێ هەستیا، دێ" . ژنکێ ئولیڤەر پالْدا، بو ژوورا ل خوارێ، ئەوا تاری، ل وێرێ کچکەك هەبوو، ل بەر کچکێ هندەك جلکێن کەڤن و دڕیای هەبوون، ژنکێ گازی کرێ "دێ شارلوت، هندەك گوشتێ سار بدەڤی، ئەوێ مە بو سەی هێلای، ئەڤە ژ سپێدێ وەرە سە نەهاتیە دیارە ناهێت ".

دەمێ ئولیڤەری گوهـ ل پەیڤا گوشتی بووی، چاڤێن وی گەش بوون . دەمێ دای ئولیڤەری زوی خوار. ژنکێ بەرێ خو ددایێ، ب دلێ وێ نەبوو، خوارنا ئولیڤەری یا بێ شەرم ، گوتێ "لگەل من وەرە سەری، دا جهێ نڤستنا تە نیشا تە بکەم، دخوازم بو تە ب زەحمەت نەبیت، نڤستن ل ناڤ تابووتا دا، زەحمەت ژی بیت، چ تشت ناهێنە گوهارتن، چونکی چ جهێن دی نینن، خو مژویل نەکە" .

دەمێ ئولیڤەر مای بتنێ، گەلەك ترسیا، ل وێرێ تابووتەکا نیڤ چێکری دیت، ئولیڤەر هەر وەکی دناڤ مریا دا دلەرزی، جهێ وی ژی وەکی مەزاری بوو . وی دڤیا چ جارێن دی ڕانەبیت ژ جهێ خو ژ بەر کو هەڤالەك بتنێ هەبوو و کەسێ خودان نەدکر. ل روژا پاشتر، دەرگەهـ هاتە قوتان ب دەنگەکێ مەزن، ئەڤ دەنگە، بیست و پێنچ جارا هاتە دووبارە کرن :

ـ دێ ڤەکە دەرگەهی، تو چ دکەی ؟

ئولیڤەری گوت، دێ نوکە ڤەکەم، ئەزبەنی، کلیل زڤڕاند .

دیارە تو ئەو زاروکێ نویێ، مانە وەیە ؟

بەلێ ئەزبەنی .

تو چەند سالی؟

دەهـ سالی، ئەزبەنی .

دێ باشە چ گاڤا ئەز هاتم ژوور دێ تە قوتم .

ئولیڤەری دەرگەهـ ڤەکر، ب تنێ گەنجەك دیت، یێ نانی دخوت، ڤی گەنجی چاڤێن بچویك هەبوون .

ئولیڤەری گوت، "تو بووی دەرگەهـ دقوتا ؟".
ئەرێ .
تە تابووت دڤێت ؟
یا ژ من ڤە تو نزانی ئەز کیمە، مالا بێ هێزا ؟
نەخێر، ئەز بەنی .
ئەز، بەرێز نوا کلەیپولم، دێ ل ژێر فەرمانین من کار کەی، نوکە پەنجەرا ڤەکە، تەمبەل . دەمێ ئاخفت ئولیڤەر قوتا و هاتە ژوورڤە .
هەردوو سوێربێری هاتنە خوارێ، و ئولیڤەر ل پشت نوای چوو لێنانگەهێ بو تێشتێ .
شارلوتێ گوت، نوا وەرە دەڤ تەباخێ . من بو تە خوارنەکا خوش یا هێلای، ئولیڤەر دەرگەهی بگرە، پاشی ڤی گوشتی بخو، چای ژی تە یا هەی، لەزێ بکە، یێ گازی تە دکەن . نوای گوت، "تە های ژێ هەیە، مالا بێ هێزا ؟ "
شارلوتێ گوت، "نوا تو بوچی وەسا گازی دکەیێ ؟، تو گەلەك کەیفی، تو بوچی بەلا خو ژێڤە ناکەی ؟"
چەوا، بەلا خو لێدان، هەمیا بەلا خو یا ژێڤە کری، دەیك و بابێن وی ژی بەلا خو یا ژێڤەکری، مانە وەیە شارلوت ؟
کچك گرنژی، گوت "تو گەلەك کەیفی !"
نوا ژی کەنی، هەردوویا بەرێ خودان ئولیڤەر تویستی، ئەوێ ل سەر سندوقەکێ نان دخوار .
نوا ژی گەنجەك هەژار بوو، بەلێ ل مالا بێ هێزا نەبوو، د زانی دەیك و بابێن وی کی نە، دەیکا وی کارێ پاقژیێ دکر، بابێ وی ژی لەشکەرەك مەی ڤەخوار، زاروکین دی ژی ب خرابی رەفتار لگەل دکر، ژ بەر هندێ کەیفا وی ب هاتنا ئولیڤەر تویستی هاتبوو، ژ بەر کو دا ئەو ژی رەفتارێن خراب لگەل ئولیڤەری کەت .

## پشکا چوارێ

## ئولیڤەر درەڤیت

د هەیڤێن دویڤدا، ئولیڤەر فێری گەلەك تشتا بوو، لگەل سوێربێری چوو گەڕیانێن کاری، هاریکاریا وی دکر، دەمێ مەزار دکولان . ل جەنازەیێن دەولەمەندا ئولیڤەر فێری تشتەك دی بوو، دەمێ کەسەك دژیا، دلنەخوش بوون، بەلێ دەمێ دمرن، پتریا وانا کەیفخوش دبوون، دەمێ زەلاما هەڤژینێن وانا دمرن، ب بێ دەنگی دروینشتن خوارێ، و دەمێ هەڤژینێن ژنکا دمرن، جلکێن رەش دکرنی بەلێ گەلەك خو جوان دکرن، دیسان دەمێ خێزان گەلەك دلنەخوش ل جەنازەی دچوون مالێ، چایەك ڤەدخوار دلخوش دبوون . د ڤی دەمی دا نوای ژیانا ئولیڤەری گەلەك نەخوش کربوو، ژ بەر هندێ شارلوتێ ژی رەفتارا نەباش لگەل ئولیڤەری دکر، ژبەر کو سوێربێری هاریکاریا ئولیڤەری دکر هەڤژینا وی بوو دوژمنا وی، ب ڤی رەنگی ژیانا ئولیڤەری گەلەك نەباش ببوو .

روژەکێ نوای سڤکاتی ب ئولیڤەری کر و ئەو قوتا، گوتێ، "دەیکا تە چەوانە مالا بێ هێزا ؟"

ئولیڤەری گوت "یا مری، بەحسێ وێ بو من نەکە "

دەمێ ئولیڤەری ئەڤە گوتی، بێهنا وی تەنگ بوو، سور بوو .

بوچی، مالا بێ هێزا ؟

وەکی بو من گوتی، ژ دل شکەستنا وێ، بێ هیڤی بوو دەمێ مری، ئەز دزانم کا مرن چەوایە ؟

دەمێ ئولیڤەر گری، نوای گوت، "چ تشتە تە دگرینیت ؟"

نە تویی .

راست ؟

نەخێر تو نینی، بەسە ئێدی، بەحسێ دەیکا من نەکە، ئێکجار .

نوای گازی کر، "ئێکجار،ئێکجار، خو مەزن نەکە مالا بێ هێزا، دلێ مە هەمیا یێ ب تەڤە، بەلی دەیکا تە یا خراب بوو، تو ژی دزانی"

تە چ گوت ؟

دەیکا تە ژنکەکا خراب بوو، مالا بێ هێزا.باش بوو هینگێ مری .

ئولیڤەر سور بوو، خو هاڤێت ستویێ نوای، نوا ل ئەردی دا . ئاخفتنێن نوای دەربارەی دەیکا وی، ئولیڤەر تورە کربوو، نوای گازی کر، وەرن ئولیڤەری دێ من کوژیت . شارلوت لگەل خانم سوێربێری هاتە ژوور، ڤێریەك ڤەدا، ئولیڤەر گرت و قوتا . خانم سوێربێریێ ئولیڤەر ب نینوکێن خو ڤەچراند، نوای ژی ئولیڤەر دقوتا . هەرسێ ژ قوتانا ئولیڤەری وەستیان، ئولیڤەر کرنە د ژوورەکا تاری ڤە، سوێربێری دگری، گوت "دا مە هەمیا کوژیت" . شارلوتێ گوت، "دخوازم بەرێز سوێربێری بو خو ئاقلی ژ ڤێ چەندێ وەربگریت و کەسەکێ ژ مالا بێ هێزا نە ئینیت، هەی ژاری نوا، دێ نوکە چکەین ؟ کەس ل ڤێرێ نینە"نوای گازی کر "ئەم گازی پولیسا بکەین؟"، خانم سوێربێری گوت" نەخێر "، نوا هەرە دەڤ بامبلی، بێژیێ بلا بهێت ڤێرێ .

نوای بامبل ل مالا بێ هێزا دیت، "ئاخ ئەزبەنی بەرێز بامبل، ئولیڤەر" کەیفا بامبلی هات، "چ؟ چ ؟ نە ڕەڤیە مانە وەیە ؟ "

نەخێر، ئەزبەنی، دا من کوژیت، پاش شارلوتێ و خانم سوێربێری ژی دا کوژیت، چەند ب ترسە"

ئاخ ژاری، دێ نوکه هێم .
لگەل نوای بەرەڤ دکانا سوێربێریا چوون، چوو ژوورا تاری گازی ئولیڤەری کر .
ئولیڤەر ل ژوور گوت "من ژ ڤێرێ دەربێخن"
تە ئەڤ دەنگە نیاسی، ئولیڤەر ؟
بەلێ .
تو ژ ڤی دەنگی نا ترسی ؟ تو نا ترسی ژ دەنگێ من؟
نەخێر .
بامبل، شاش بوو، ژ دەرگەهی دویر کەفت و بەرێ خو دا یێن دی . خانم سوێربێریێ گوت "تو دزانی بەرێز بامبل، ئەڤە یێ دین بووی، چ زاروکین ب ئەقل، ب ڤی رەنگی لگەل تە نا ئاخڤن " بامبلی پیچەك هزرێن خو کرن، گوت "دین نەبوویە، دەردێ وی هەمی، گوشتە"
چ ؟
گوشت خانم سوێربێری، هەوە گەلەك گوشت یێ دایێ، ئەگەر بتنێ هندی وێ خوارنێ وە دابایێ یا ئەم ل مالا بێ هێزا ددەینێ، ئەڤە چێنەدبوو .
خودایێ من، ئها ئەڤەیە دویماهیا دەست ڤەکرییێ .
روژەکێ دوویا بهێلن ل ڤێ ژوورێ ڤە، پاش ژ شوربێ زێدەتر نەدەنێ، هەرچەوا بیت ژ خێزانەکا خرابە .
دەمێ سوێربێری هاتی مال، هەمیا چیروك بو ڤەگێرا، ئولیڤەر ژ وێرێ ئینا دەر، بەرێ خودایێ جلکێن وی یێن پەرتین، و هێشتا روویێ وی سورە . زلەهەك ل بن گوها دا، " ئێدی دی بی زاروکەکێ، باش مانە وەیە ؟"
نوای بەحسێ دەیکا من ب خرابی کر .
خانم سوێربێری گوت "ما چ چێبوویە ؟ دەیکا تە وەسانە، خرابترە ژی "
نەخێر ئەڤە درەوە دەیکا من وەسا نینە .
بەلێ وەیە .
ئەڤە راست نینە .
خانم سوێربێری، دەست ب گری کر، دەمێ سوێربێری ڤیای، دلوڤانیێ ب ئولیڤەری ببەت، پشتی هەڤژینا وی گری، وی خواست ئولیڤەری بقوتیت، گەلەك قوتا و کرە د ژوورا تاری ڤە، دەمێ بووی شەڤ گوتە وی، هەرە ژوورا سەریا دکانێ . ئولیڤەر دەمێ مای بتنێ، دەست ب گری کر، و گری، ئولیڤەر بو دەمەکێ درێژ ما وەسا، شەمالکا ل هنداڤ وی ڤەدمریا، پاش دەرگەهـ ڤەکر و بەرێ خو دا ژدەرڤە، شەڤ سار و تاری بوو، دەرگەهـ گرت، پاریەك دووێن نانی کرنە د ناڤ دەستمالەکێ دا، ل روناهیا ئێکێ یا روژێ، ئولیڤەری دەرگەهـ ڤەکر و ب ترس ڤە دەرگەهـ ل پشت خو گرت و چوو سەر جادێ .

## پشکا پێنجێ
## بەرەڤ لەندەن

ئولیڤەری نەدزانی دێ چیتە کیڤە ؟، زانی ترومبێل بەرەڤ سەری ڤە دچن، ئەو ژی وەسا چوو . ئەو رێکا ئەو تێرا چووی مالا خانم مانێ ژی ل وێرێ بوو، دلێ وی زێدە دقوتا، بەلێ نەدڤیا بزڤریت، و ترسا دیتنێ ژی ل دەڤ نەبوو ل سپێدەهیا زوی . هات بەرامبەر خانی، بێ دەنگ یبوو، بەرێ خو دا باخچەی، ل وێرێ زاروکەکی کار دکر، هەڤالەکێ وی کەڤن ل مالا بێ هێزا، کەیفا ئولیڤەری هات دەمێ دیتی، لگەل ئێك دهاتنە قوتان، دەمی زاروك بەرەڤ دەرگەهێ باخچەی ڤە هاتی، ئولیڤەری گوتێ، "بێ دەنگ بە، هەمی ل خەون ؟"

ژ بلی من هەمی یێن ل خەو .

نە بێژە کەسێ من ئولیڤەرێ دیتی، دیك، دێ ئەز ڕەڤم، ئەز ڤوتام ب خرابی، دێ ژ ڤێرێ چم، تو ژی نەخوشی دیك .

من گوهـ لێ بوو، دەمێ نوژداری گوتیێ دێ مریت بەحسا من، کەیفا من ب دیتنا تە هات، ئولیڤەر، نە راوەستە ژ ڤێرێ هەڕە .

ئەز راوەستیام دا بێژم تە بخاتراتە، دزانم دێ تە بینم ڤە، دەمێ تو باش بی دێ دلخوش بی .

هێڤیا من ئەوە . لێ پشتی مرنی، ئەز ژ نوژداری باوەر دکەم، چونکی دەمی ئەز نڤستی بهەشتێ و دەمێ ئەز هشیار روییێن باش دبینم، من ماچێ بکە .

زاروکی خو هاڤێت سەر دەرگەهێ نزم و دەستێن خو دان ئولیڤەری .

ڤ خێر بچی، خودێ تە بپارێزیت .

بو جارا ئێکێ بوو، ئێك ژ خودێ بخوازیت دا ئولیڤەری بپارێزیت، ئولیڤەری هەتا دویماهیێ ئەڤە ژ بیر نەکر، ئولیڤەر بێی راوەستیان ڕەڤی، پاش رویشت سەر بەرەکی، هزرێن خو کرن، ئەو بەرێ ل سەر روینشتی هاتبوو نڤێسین لەندەن حەفتێ ێ میلا ژێ دویرە، لەندەن ئەو باژێرێ هندە مەزن، کەسێ ل وێرێ نەددیت، بامبلی ژی . هزرێن خو کرن، دێ چەوا چیتە لەندەن ؟، هندەك پارە و نان و جل و بەرگێن دڕیای هەبوون، دێ چەوا ئەڤە بنە هاریکارێن من بو لەندەن ل ڤێ روژا زڤستانێ . ل وێ روژێ بیست میلا ب رێڤە چوو، بتنێ پاڕییێن نانی و هندەك ئاڤا ژ مالا دخواست چوو دزکێ وی دا، دەمێ بووی شەڤ ل بیستانەکی نڤست، سار بوو و گەلەك با دهات، ل روژا پاشتر گەلەك برسی و سار ببوو، ل وێ شەڤێ گەلەك وەستیا، ب خورتی رێڤە دچوو، ئولیڤەر ب درێژاهیا روژا لاواز دبوو، ئەگەر کەسەکی پێنیر و نان و پیرەژنەکێ هندەك نان و پەیڤێن خوش نەگوتبانێ دا وەکی دەیکا خو مریت . پشتی حەفت روژا ئولیڤەر گەهشتە باژێرەکێ بچویك ب دویراتیا 7 میلا ژ لەندەن، ئولیڤەر کەفتە بەر دەگەهێ مالەکێ، هەمی ببوو توز . جاددە ڤالا ببون، پشتی دەمەکی خەلك دهات و چوو، هندەکا بەرێ خو ددا ئولیڤەری، بەلێ کەس لگەل نە دئاخفت، پاش ئولیڤەری دیت، کورکەك یێ دهێت دەڤ وی، گوتێ "سلاڤ، دەردێ تە چی یە ؟" کورکەك پیس بوو، هندی ئولیڤەری بوو، "دەردێ تە چی یە ؟ "

ـ ئەز گەلەك برسی و وەستیایمە، ژ رێکەکا دویر دهێم ئەڤە حەفت روژە، یێ برێڤە دچم . چاڤێن وی تژی روندك بوون .

ـ حەفت روژ، نوکە ئەز تێگەهشتم، من گەلەك پارە نینن، بەلێ دێ بو تە خوارنەکێ کڕم، ڕابە .

هاریکاریا ئولیڤەری کر دا ڕابیت، برە جهەکی خوارنەك دایێ، ئولیڤەر لگەل هەڤالێ خو یێ نوی تێر ببوو، پشتی خوارن خوارنێ کورکی گوتێ، "دێ چی لەندەن ؟"
ئەرێ .
تە جهەك هەیە لێ بمینی ؟
نەخێر .
پارە ؟
ئەو ژی، تو ل لەندەن دژی ؟
ئەرێ، دەمێ ئەز ل مال دمینم، دڤێت تە جهەك هەبیت بو ئەڤ شەڤە، دا تو لێ بنڤی.
یەلێ راستە، ئەڤە چەندە ئەز ل ژیر بانەکی نە نڤستیمە .
بو خو نەکە خەم، دڤێت ئەز ئەڤ شەڤە ل لەندەن بم، دێ جهەك هەبیت تو لێ بنڤی، ئەز کەسەکێ پیر ل وێرێ دنیاسم، ئەو من دزانیت .
ئولیڤەری ناڤێ کورکی زانی (چێك دووکینس) بوو، چێکی دڤیا ژ بەری تاریاتیێ بگەهیتە لەندەن، ژ بەر هندێ دەمێ گەهشتین لەندەن، دەمژمێر      یازدە بوو، چێك بلەز دچوو، ئولیڤەر لگەل گەهشتنە گەڕەکەکێ کو پیسترین گەڕەك بوو دیتی د ژیانا خو دا، گەڕەك تژی بوو ژ سەرخوشێن زەلام و ژنك . ئولیڤەر دا ڕەڤیت، دووکینسی دەستێ وی گرت، دەرگەهەك ڤەکر و چوونە ژوور، ژوورڤە تاری بوو، ئولیڤەری زەلامەك دیت، زەلامی گوت "هوین دوو کەسن، یێ دی کی یە ؟" دووکینسی ئولیڤەر پێشڤە بر، گوت "هەڤالەك نوی یە، فاغن ل سەری یە ؟" ، "ئەرێ هەڕن سەری" . دوویکینسی دەستێ ئولیڤەری گرت، چوون سەری  ل سەر دەرێجێن شکەستی و جهێ تاری، چوو ژوورەکێ و ئولیڤەر کێشا بوو ژوور . دیوارێن ژوورێ ژ پیساتیێ رەش بوون، ل دەڤ سوپێ میزەك هەبوو، شەمالکەك ل سەر و دوو سێ فنجان، نانەك، هندەك نیڤشك و سێنەکەك، ل سەر ئاگری گوشت دکەلی .ل دەڤ تەباخێ پیرەمێرەك هەبوو، ناڤێ وی فاغن بوو، پیس بوو، چاڤێ وی ل گوشتی و دەستمالا بوو، ل دوور مێزێ چوار پێنج زاروك هەبوون، ئەوان ژی مەی د ڤەخوار لگەل ڤەلینی، دوویکینسی تشتەك ل بەر گوهێ فاغنی گوت، زاروك لێ کومبوون، هەمیا بەرێ خو دا ئولیڤەری، پاش کەنین لگەل فاغنی . چێکی گوت، "ئها ئەڤەیە فاغن . ئەڤ زاروکە، ناڤێ وی ئولیڤەر تویستە"، زەلامێ پیر دیسا کەنی، و سلاڤی ئولیڤەری کر، دەستێ وی گرت و گوتێ "دێ هەڤالینیا تە، مە دلخوش کەت"، پاش کورکێن دی هاتن و دەستێن ئولیڤەری تایبەت یێ دەستمال ل دەستی دا گرتن و سلاڤ کرنێ، ئێکی دەستێن خو کرنە د بەریکا وی دا، دا کو زەحمەتێ نەبەت دەمی دنڤیت . فاغنی گوت :
- کەیفا مە هات، مە تو دیتی ئولیڤەر . تو یێ بەرێ خو ددەیە، ڤان دەستمالا، مەیێن ئامادە کرین، دا کو بشوین، هەمی ئەڤە یە، ها ها ها .
زاروك هەمی ب ڤێ ئاخفتنێ کەنین و شیڤ خوارن، پاش جهەك ل ئاخێ دانە ئولیڤەری دا کو بنڤیت، ئولیڤەر ژی نڤست .

## پشکا شەشێ

## ڤاغن و تورا وی

دەمێ ئولیڤەر ل سپێدەهیا دی ژ خەو رابووی، دەم درەنگ بوو، ژ بلی زەلامێ پیر کەس ل وێرێ نەبوو، دەمێ قەهوە ئامادە بووی، زەلامێ پیر بەرێ خو دا ئولیڤەری، گازی کرێ . بەرسڤ نەدا . ڤاغنی هزر کر هێشتا ئولیڤەر نڤستیە، دەرگەهـ گرت و کارتونەك ئینا دەر، دانا سەر مێزێ، پاش روینشت خوارێ، دەمژمێرەکا گەلەك جوان ژ کارتونێ ئینا دەر، ب گر نژینەکا خراب گوت، "زاروکێن باش، یێن راستگو، دەربارەی ڤاغنی تشتەکی نابێژن، ما دێ بو بێژن ؟، ئەڤە نابیتە ئەگەرێ سێدارەدانا کرنا وانا . زاروکێن باش" پشتی دەمژمێر هەلگرتی، شەش دەمژمێرێن دی ئینان دەر، ژ بلی دەمژمێرێ گەلەك تشتێن دی هەبوون یێن ب بها . زەلامی ب دەنگەکێ درندانە گوت " دارڤەکرنا مروڤا، چەند هزرەکا باشە، مری دلنەخوش نابن، نا ئاخڤن، کارێ مە ژ بو هندێ یێ باشە، پێنج لگەل ئێك هاتنە سێدارەدان، و کەس نەمایە چیروکا ڤان زێرا بێژیت " دەمێ د ئاخفت، چاڤێن وی و ئولیڤەری کەفتنە ئێك، هزر کر ئولیڤەری یێ گوهـ ل هەمی ئاخفتنێن وی بووی، کارتون ڕاکر و کێرەك خوارنێ ل سەر مێزێ ڕاکر و بەرامبەر ئولیڤەری ڤە چوو .

تو هشیاری مانە وەیە ؟ بێژە بچویك، زوی ! زوی، ئەگەر تە بڤێیت بژی، بێژە .

زێدەتر ئەز نە نڤستم، ئەز بەنی . ببورە، ئەگەر من تو نە رحەت کربی، بتنێ ئەز هشیار بووم .

تە چ تشتێن جوان ژ ڤانا دیتن ؟

بەلێ، ئەزبەنی .

ڤاغنی، کێر دانا سەر مێزێ و گوت " یا! "، ئەو یێن منن ئولیڤەر، ب ڤی ژیێ مەزن، ئەز ب ڤانا دژیم "، ل وی دەمی چێك و هەڤالەکێ وی ب ناڤێ چارلی بێتس هاتنە ژوور .

ئوو، زاروکین خوشتڤی، دخوازم هوین چوو بن کاری، ڤێ سپێدێ .

چێك ــ مە گەلەك کار کر .

چارلی ــ گەلەك .

دەست خوش، تە چ ئینایە، دووکینس .

ـ دوو گینیکێن پارا . گینیك دانە ڤاغنی .

ـ وەکی من هزر دکر، گران نینن، بەلێ کارەك باشە، ئەڤ زاروکە باش کار دکەن، مانە وەیە، ئولیڤەر ؟، گەلەك باشە، چارلی کەنی، تا وی ڕادەی ئولیڤەر ما حێیەتی، ئولیڤەری چ تشت نەددیت پێ بکەنیت. ڤاغنی، گوت چارلی " تە چ ئینایە ؟ " چارلی ژ بەریکا خو چوار دەستمال ئینان دەر، گوتێ "ئوستا، دەستمال"ڤاغنی باش بەرێ خو دا دەستمالا، باشە، دەستمالێن باشن، بەلێ تە باش، ئیشارەت نەکرینە . "چارلی یا باشە ب دەرزیکەکێ، ئەم ڤان نیشانا دەربێخین و نیشا ئولیڤەری بدەین، تو چ دبێژی، ئولیڤەر ؟ها ها ها "

تو جەوا بخوازی، ئەزبەنی .

تە ژی دڤێت، وەکی چارلی دێ چەوا ب باشترین شێواز، نیشانا دەرئێخی، مانە وەیە خوشتڤیێ من ؟

چارلی دیسا کەنی، پشتی تێشتێ هەر دوو زاروکا لگەل ڤاغنی یاریەك سەیر ئەنجامدان، زەلامێ پیر هندەك تشت کرنە د بەریکێن خو دا، پاش وەکی زەلامێن پیر، ل سەر جادێ برێڤە دچوو،

پاش د ڕاوەستیا، پاش بەرێ خو دا دەوروبەرێن خو، هەروەکی ژ دزیکەرا دترسیت، دەستێن خو کرنە د بەریکێن خو دا، ئولیڤەر کەنی تا روندك ژ چاڤا هاتین، هەردوو زاروکا ژی بەرێ خو ددایێ، دەمی زەلامی بەرێ خو ددایێ خو ڤەدشارت، ل دویماهیێ دووکینس، پێ ل پێ فاغنی کر، پاش چارلی ئەو پاڵدا، د ڤی دەمێ کورت دا زار وکا بەریکێن زەلامی ڤالا کرن، دەمێ یاری دهاتە کرن، ئەگەر زەلامی گازی کربا، دا یاری ژ سەری پێڤە دەست پێکەت، دوو ئافرەتێن گەنج هاتن دەڤ، هەر دوو گەنجا، ناڤێن وانا بێت و ئانسی بوون، رویی وانا تژی بوو ژ بویاغێ، رەفتارێن وانا ئازادانە بوون، ئولیڤەری هزر کر ئەو گەلەك تێگەهشتی نە . لگەل ئێك دەرکەفتن، فاغنی گوت ئولیڤەری "ئەها وەسا، ئەو چوون، ئەڤروکە ناهێن، ژیانەکا خوش یێن هەین مانە وەیە ؟
کارێ وانا ب دویماهی هات، ئەزبەنی .
ئەرێ، ئەگەر تە ژی چ کار ێێ وەکی وانا نەبن، تو وەکی وانا بکە، دێ ئەو روژەکێ بنە کەسێن مەزن، دێ هاریکاریا تە کەن، دا تو ببی کەسەکێ مەزن، بەرێ خو بدیێ، کا دەستمال ژ بەریکا من دەرکەفتیە .
بەلێ، ئەزبەنی .
دێ بەری خو دەینێ، کا دێ شێی ئینی دەر، بێی ئەز بزانم .
ئولیڤەری وەکی وان زاروکا کر، فاغنی گازی کر، تە ئینا دەر .
بەلێ ئەزبەنی، ئەڤەیە .
تو زاروکەکێ باشی، دەستخوش .
بو تە پاوندیەك، ئەگەر تو وەسا بەردەوام بی، دێ بیە گرنگترین کەسێ سەردەمی مە، وەرە دا بێژم تە دێ چەوا نیشانا ژێ ئینیە دەر
ئولیڤەر تینەگەهشت بوو کا دێ ڤێ یاریێ چ مفا هەبیت بو زەلام ی، بەلێ هێشتا نەگەهشتبوو دەهـ سالیێ، هزر کر فاغن ژ وی گەلەك مەزنترە، یا باش ئەو دزانیت .

## پشکا حەفتێ

## ئولیڤەر دگەل دزیکەرا

بو روژێن درێژ ئولیڤەری بەریکێن فاغنی ڤەدکرن و تشت ژێ د ئینان دەر، وی ژی یاری دکرن، پاش ئولیڤەر ژ دەرڤە غەریب بوو، هێڤی ژ فاغنی کرن لگەل وانا دەرکەڤیت ژ دەرڤە،
سپێدەه یەکێ زەلامێ پیر رێ دایێ دەرکەڤیت، هەر سێ زاروك دەرکەفتن، دووکینس راوەستیا، تبلا خو دانا سەر لیڤێن خو هەڤالێن خو پاشڤە برن، ئولیڤەری پرسیار کر "چی هەیە ؟"
بێ دەنگ بە، هوین وێ زەلامێ پیر دبینن، ئەوێ لبەر پەرتوکخانێ راوەستایی .
ئەرێ .
ئەو باشە .
چارلی ـ گەلەك باشە .
ئولیڤەری حێبەتی ڤە بەرێ خو دا وانا، هەردوو زاروك بەرەڤ لایێ دی ڤە چوون ، چوون پشت وی زەلامی، ئولیڤەری بەرێ خو ددا وانا، ئەوێ پیر پەرتوك دخواند، دووکینسی دەستێ خو کرە د بەریکا زەلامی دا دەستمال ئینا دەر و دا چارلی و هەردوو ڕەڤین . ئولیڤەری وی دەمی یاریا وی دکری تێگەهشت، پیچەکێ بی دەنگ ما، پاش ڕەڤی . زەلامێ پیر، دەستێ خو کرە د بەریکا خو دا، دەستمال نەدیت، دیت ئولیڤەرێ د ڕەڤیت، هزر کر وی یێ دزی .گازی کر "راوەستە دزیکەر"، پەرتوك دانا و لدویڤ چوو، کەسێن ل جادێ، ل دویڤ ئولیڤەری ڤە چوون، گازی دکرێ "راوەستە دزیکەر"، تا وی رادەی دووکینس و چارلی ژی لگەل وانا ڕەهێلا ئولیڤەری .
ل دویماهیێ، ئێکێ ئولیڤەر دەحف دا، ئولیڤەر کەفت، رویێ وی هەمی ببو و خوین، پرسیار ژ وی کەسی کرن "دزیکەر ئەڤە بوو ؟"
ـ ئەرێ، مخابن ئەڤ زاروکە یێ بریندار بووی .
پولیسەك هاتە ناڤ واندا، ئولیڤەر گرت، "دێ ڕابە" . ئولیڤەری گوت "نە ئەز بووم، ئەزبەنی، دوو زاروکێن دی بوون، دێ ل ڤان نیزیکا بن " بەلێ دووکینس و چارلی دویر کەفتبوون .
پولیسی گوتێ "دێ ڕابە "
زەلامێ پیر – وی نە ئێشینن .
پولیسی ئولیڤەر ل سەر جادێ رادکێشا، زەلامەك هاتە دەڤ وانا، گوتێ"راوەستن، دێ وی بەم، راوەستن"
پولیس – چی یە ؟ تو کیێ ؟
ئەز یێ ل بەر پەرتوکخانێ، من هەمی دیتن، سێ بوون، ئێك ئەڤە، دوو یێن دی، بەرێز برانلوی پەرتوك دخواند، زاروکێن دی دزین، ئەڤی چ نەکریە . وی بەرێ خو ددایێ . پولیسی گوت " دڤێت ئەز ڤی زاروکی بەردەم "، دەستێ وی بەردا . دلێ ئولیڤەری گرت، رویێ وی سپی ببوو، زەلامێ پیر ئانکو برانلوی گوت " زاروکێ ژار، زارو کێ ژار، "ئیك ژ هەوە گازی ترومبێلەکێ بکەن، هێڤیە زوی " ترومبێلەك هات، ئولیڤەر کرنە تێدا و برانلو لگەل چوو، ترومبێل د ناڤ جاددەیێن لەندەن بو مالەکا خوش چوون، دەمێ دووکینس و چارلی چووین دەڤ فاغنی، فاغن ل هێڤیا وان بوو، ب تورەی ڤە "ئولیڤەر ل کیڤە یە، زاروك ل کیڤە یە ؟"زاروکێن دزیکەر، بەرێ خو دان وی، بەلی نەئاخفتن . فاغنی دووکینس گرت، گازی کرێ " چ ل زاروکی هات ؟، ب ئاخڤە، یان ژی دێ تە کوژم "

- پولیسەکی ئەو گرت و بر . من بەردە .
- دووکینسی خو ژ دەستا ئینا دەر و کێرەك ل سەر میزێ ڕاکر، فاغنی فنجانەك ڕاکر و هاڤێت سەرێ دووکینسی، زەلامەك هاتە ژوور، چ نەمابوو، دا ب وی زەلامی کەڤیت، زەلامی گوت " کێ ئەڤە هاڤێت من؟" زەلامەکێ سیهـ پینج سالی بوو، یێ ب قرێژی بوو، ناڤێ وی بیل سایکس بوو، پاش سەیەکێ سپی ژی ل پ شڤ وی هاتە ژوور . زەلامی گوت " تو چ ل ڤان زاروکا دکەی؟، حێبەتی مە چەوا تو نەکوشتیە تا نوکە "
- هێدی بەرێز سایکس، وەسا ب توڕەی ڤە نە ئاخڤە، یێ دبینم، تو ئەڤروکە یێ توڕەی .
- بەلکی، کا مەیێ بدە من فاغن .
دەمێ سایکسی، مەی ڤەدخوار، دووکینسی بو سەرهاتیا ئولیڤەری دگوت، کا چەوا هاتە گرتن .
فاغن – ئەز یێ دترسم زاروك بو پولیسا بەحسێ مە بکەت . دڤێت ئەم وی ببینین .
- ئەرێ دڤێت ئیك وی ببینیت.
دەمی دزیکەرا هزرێن خو دکرن، دوو کچێن گەنج هاتنە ژوور، بێت و نانسی بوون، فاغنی گوت " بتنێ ئێك تشتێ هەی، ئەم بکەین، دێ بێت چیت، مانە وەیە ؟"
- کیڤە ؟
- ل دەڤ پولیسا، دێ پرسیار کەی، کا ئولیڤەر ل کیڤە یە ؟، وان زاروکێ بری، دڤێت ئەم وی بزڤرینین .
- کەس من ڤڕێناکەتە وێرێ .
- نانسی، تو چ دبێژی ؟
نانسی – نەخێر .
سایکس – دێ چیت، دێ چیت فاغن .
نانسی – ناچیت، فاغن .
سایکس –بەلێ دێ چیت.
نانسی ل دویماهیێ رازی بوو، بچیت، جلکێن پاقژ کرنە بەر خو، کچکەکا شرین بوو، نانسیێ ڕولێ گری کر، گوت "برایێ من یێ خوشتڤی ئولیڤەر ، چ ل وی هاتیە ؟ برە کیڤە ؟، هێڤی دکەم، بو من بێژن، چ ل وی کریە ؟"
فاغنی و سایکسی گوت "گەلەك باشە، تو کچەکا باشی، نانسی، نوکە هەڕە، وی پولیسی ببینە "، دەمێ نانسی زڤڕی بو وانا گوت، کا چ ئولیڤەری هاتیە . "زەلامەکی یێ بری، ناڤێ وی برانلو یە، ئەو زەلامێ دووکینسی دەستمالا وی بری، بەلی نزانن کا مالا وی ل کیڤە یە ؟"
فاغنی گازی کر "دڤێت ئەم ئولیڤەری ببینین، چارلی، تو هەر روژ، دێ چاڤدێریا وێ پەرتوکخانێ کەی، نانسی، دڤیت ئەم ئولیڤەری ببینین، دێ ڤێ مالێ گرم، باوەری نەمایە، هوین دزانن، دێ من ل کیڤە بینن، ئەم نا راوەستین ل ڤێرێ، هەڤالێن من، ئولیڤەری ببینن، ئەز یێ دبێژم هەوە وی ببینن "، دەمێ ئەڤ ئاخفتنە گوتین، فاغنی ئەو ب پاڵدانێ ژ ژوور دەرئێخستن، پاشی ئەو کارتونا ﯚلیڤەری دیتی، کرە د بن چاکیتێ خو ڤە و دەرکەفت.

## پشکا هەشتێ

## ئولیڤەر ل مالەکا باشتر

ئولیڤەر ل مالا برانلوی ببوو مێهڤان، نەخوش بوو، چەند حەفتیەکا ڕانەبوو، دەمێ پیچەکێ باش بووی، شیا لگەل برانلوی و خزمەتکارا وی خانم بێدوینێ ب ئاخڤیت . هەڤالێن وی یێن نوی، باش چاڤدێریا وی دکرن، خانم بێدوینێ خوارنێن خوش ددان ئولیڤەری، ل روژەکێ وێنەیەکی بالکێشیا ئولیڤەری کێشا، وێنەیێ ئافرەتەکا زەنگین بوو، ئولیڤەری گەلەك بەرێ خو دا وێنەی، خانم بێدوینێ گوتێ " تو گەلەك حەز ژ وێنا دکەی؟ " .

- نزانم، من کێم وێنە یێن دیتین، ئەز نزا کا ئەز حەز ژ ێ دکەم، یان نە . بەلێ ئەڤ خانما د وێنەی دا گەلەك جوانە .

- وێنەکێش، خانما جوان وێنە دکەن .

- ئەو وێنە یێ کێ یە ؟

- نزانم، تو گەلەك مایێ پیڤە گرێدای .

- گەلەك، گەلەك جوانە .

- تو پشت راستی تو ژێ ناترسی؟ (پشتی دیتی، ئولیڤەر یێ بترس ڤە بەرێ خو ددەتێ ).

- نەخێر، نەخێر، بەلێ دیارە یا دلنەخوشە، هەروەکی بەرێ خو ددەتە من، هەروەکو وێنە ب رحە، دڤێت لگەل من ب ئاخڤیت، بەلێ نا ئاخڤیت .

خانما پیر گازی کر "خودایێ من مە ب پارێزە ، وەسا نە ئاخڤە کورێ من، تو یێ لاواز بووی، پشتی نەخوشیێ،تە ببەم لایێ دی دا تو وێنەیی نەبینی "

ئولیڤەری وێنە هەلگرت د بیرا خو دا، بەلێ هزر کر خرابە ژنکا پیر دلنەخوش بکەت، کەنی و خوارنا خو خوار . دەمێ برانل و هاتی ژوور دا ئولیڤەری ببینیت، چ اڤێ وی ب وێنەی کەفت، بەرێ خودایێ، گازی کر، خانم بێدوین، "بەرێ خو بدەیێ"، ب دەستێ خو وێنە و ئولیڤەر نیشا کرن، چاڤ، دەست، لێڤ وەکی ئێك بوون، هەروەکی کوپیا ئولیڤەری بوو . ئولیڤەر تێنەگەهشت، بەلێ گەلەك ب هێز نەبوو، دلێ وی گرت، ل روژا پاشتر دەمێ ئولیڤەر هاتی ژوورا بێدوینێ، وێنە پێڤە نەبوو .

- برە کیڤە ئەو وێنە ؟

- تو دلنەخوش دکری، وێنە بەرێز برانلوی ڕاکر، دا کو تو زوی باش ببی .

- نەخێر، ب ڕاستی، ئەز پێ دلنەخوش نەدبووم، بو من خوش بوو، من بەرێ خو دابایێ، من حەز ژێ کربوو .

- دێ باشە، تو باش ببە، دێ وێنەی ئینین ڤە، باشە، ئەز سوزێ ددەمە تە، وەرە دا هندەك تشتێن دی ب ئاخڤین .

ئولیڤەر باش بوو، کەیفخوش بوو ل مالا برانلوی، روژەکێ برانلوی پرسیار ژێ کر، "ئەگەر تو مەزن بووی تە بڤێت چ بکەی ؟ "

ئەزبەنی، هیڤی دکەم، بهێلن، ئەز ل ڤێرێ بمینم، دێ بم خزمەتکارێ هەوە .

دێ مینی، هندی تو بێ ئاریشە بی ، بەلێ بو من چیروکا خو بێژە، تو ژ کیڤە هاتی؟، دەمی تو بچویك کێ تو خودان دکری ؟، تە چەوا بەشداری لگەل وان دزیکەرا کر، یێن من دیتین ؟، تو ب هێزی تا تو بو من بێژی، بو من راستیێ بێژە، هندی ئەز بژیم دێ تە خودان کەم .

ئولیڤەر گری، پاش هەمی تشت بو برانلوی گوتن، ل وی دەمی دەرگەهـ هاتە قوتان، یێ هاتی هەڤالەکێ، برانلوی گریمویگ بوو، هاتبوو چایێ ڤەخوت .
ئولیڤەری گوت "ئەز بچم، ئەزبەنی "، برانلوی گوت "نەخێر، بمینە ل ڤێرێ، ئەڤە ئەو زاروکە گریمویگ، ئولیڤەر تویست، ئەوێ من بو تە بەحس ژێ کری "، سلاڤی ئولیڤەری کر . بەرێ خو دا ئولیڤەری، دزانی هەڤالێ وی دلوڤانە، دێ زاروکەکێ ل جاددێ دیتی، ئینیت مال خودان کەت .
هم، ئەڤە ئەو زاروکە؟ ژ کیڤە هاتیە ؟، ئەڤە کیژ زاروکە ؟ چ کار دکەت ؟، دێ کەنگی گوهێ خو دەینە چیروك و سەرهاتیێن ئولیڤەری ؟
سباهی سپێدێ، سباهی ل دەمژمێر دەهێ وەرە دەڤ من، ئولیڤەر دێ هەمی تشتا بو مە بێژیت .
باشە، ئەزبەنی .
هەڤالێ برانلوی چوو بەر گوهێ وی گوتێ "ە هڤالێ من، ئەڤ زاروکە بو تە نابێژ یت، تو زوی باوەریا خو، ب کەسا دئینی یێ تە د خاپینیت "
نەخێر وە نینە .
باشە، ئەگەر تە نە خاپینیت، دێ دەستێ خو برم .
ل وی دەمی، بێدوین، د دەستێ وێ دا پەرتوك هاتە ژوور گوت "دڤێت ئەڤ پەرتوکە ئەڤروکە بهێنە زڤراندن "
گریمویگی گوت "وانا لگەل ئولیڤەری ڤرێکە، ئەگەر تە باوەری پێ هەبیت، بلا ئەو ببەت ل جهێ تە "
ئەزبەنی دێ ئەز بەم، دێ بلەز دێ چم وێرێ .
برانلوی نەدڤیا ئولیڤەر دەرکەڤیت، بەلێ دڤیا گویمویگ خەلەت ببیت ، دڤیا بزانیت ئولیڤەر زاروکەکێ باوەریێ یە . گوت ئولیڤەری "ببە، کورێ من "
- بێژە کارمەندێ پەرتوکخانێ، ئەڤ پەرتوکە یێن زڤراندین، و دێ دەینێ تە دەتە تە، پاش پارێن ماین بینەڤە .
- باشە، دێ زوی زڤرم .
پەرتوك کرنە د دەستێ خو دا، پارە کرنە د بەریکا خو، سلاڤ کر و ژ ژ وورێ دەرکەفت .
بێدوینی ئولیڤەر گەهاندە بەر دەرگەهی، رێکا کورت نیشا دا، دەمێ چووی، بێدوینی گوت " خودێ ب پارێزیت، ب دلێ من نینە چووی "
برانلوی گوت "پشتی بیست خولەکێن دی دێ ل ڤێرێ بیت "
گریمویگ – یا، تو ە ڤی دکەی، ئەو بزڤریت .
برانلو گرنژی، " تو ە ڤی دکەی ؟"
گریمویگ – نەخێر، ئەز ە ڤی ناکەم، جلکێن جوان ل بەر، د بەریکا وی دا پێنج پاوند، تژی پەرتوك، دێ چیتە دەڤ هەڤالێن خو یێن دزیکەر، دێ ب تە کەنن، ئەگەر زڤری ڤە، دێ ئەز ژی دەستێ خو برم . دەمێ د ئاخفتن، گریمویگ روینشت خوارێ و مان ل هێڤیا ئولیڤەری .

## پشکا نەهێ

## زڤرین بو ناڤ دزیکەرا

ئولیڤەر نێزیکی پەرتوکخانێ ببوو، هند دیت، کچەکێ گازی کر، "برایێ من" . دەمێ ڤیای بزانیت کا کی یە، دیت دوو دەستێن هاڤێتین ستویێ وی، "تو کی؟، تە چ دڤێت ؟" کچا گەنچ گوتێ "من تو دیتی ؟"، ئولیڤەر، تە چەند نەخوشی دانە من، وەرە مال"، دەمێ ئەڤ کچە دگری، کەسێن دی ل وێرێ کومبوون، دوو ژنکا پرسیار ژ وێ کر "کا چ چێدبیت ؟ " ئەڤە برایێ منە، ژ بەری هەیڤەکە یێ ژ مال رەڤی، دەیك و بابێن من، مروڤێن باشن، ئەو رەڤی و بو دزیکەر، دا دەیکا من مریت .
ژنکەکێ گوت " بەرمایکێ شەیتانی، بزڤڕە مالا خو، زاروکێ خراب .
ئەز خراب نینم، ئەز ڤێ کچکێ نا نیاسم، خوشکا من نینە، و من باب ژی نینە .
درەوا دکەت .
ئولیڤەری رویێ وی دیت، زانی نانسیە . نانسیێ گوت "هوین دبینن ؟،من دنیاسیت، بێژنێ بلا بهێتە مال، هاریکاریا من بکەن، دا ببەم مال " بیل سایکس ژ دکانەکێ دەرکەفت، گوت "چ چێدبیت ل ڤێرێ؟، زاروکێ خراب، بزڤڕە مالا خو "، ئولیڤەری گوت "ئەز ڤانا نا نیاسم، من رزگار بکەن "، سایکسی ئەو گرت "رزگار کرن ها، دێ باشە دێ تە رزگار کەم، شەیتانێ بچویك "، پەرتوك ژ دەستی ئینان دەر و ل سەرێ وی دان، ئێکی گوت " وەسا باشە ، باشترین رێکە بو وی "دوو ژنکێن دی ژی " دێ ئەڤە ئاقلێ وی کەتە د سەرێ وی دا"، ئولیڤەر بی هێز بوو، ما دا چ کەت ؟ "، هاتە راکێشان د جاددەیان دا . بوو شەڤ، ل مالا برانلوی، خانم بێدوین ل بەر دەرگەهی راوەستیای بوو، خزمەتکارەك ل سەرێ گەرەکی دچوو بنێ گەرەکی د ا ل ئولیڤەری بگەریت، دوو زەلامێن پیر ل سەری بێ دەنگ بوون، نانسی و بیل سایکس ل کولانێن تەنگ د رەڤین، پشتی نیڤ دەمژمێرێ، ل دەمەکی ل بەر دکانەکا جلکێن پیس راوەستیان،
سایکسی زەنگل لێدا، دەرگەهـ هاتە ڤەکرن، چوون ژوور، ژوورا تاری بوو، س ایکسی ئولیڤەر راکێشا خوارێ، ئێك د کەنی، ئەو چارلێ بێتس بوو . چآرلی گازی دکر، "ئها یێ ل ڤێرێ، ئوف فاغن، بەرێ خو بدە جلکێن وی، و پەرتوکا، و رەوشەنبیرە، دێ دلێ من ژ کەنی گریت، من بگرن "، فاغنی، خو چەماند بو ئولیڤەری، "دلێ مە خوش بوو، مە تو دیتی، تو گەلەك باشی، بلا چارلی جلکەك دی بدەتە هەوە، دێ پیس بیت، تو بوچی دوو رێز نە دنڤێسین بو مە دابێژی ئەز دێ هێم، دا بو تە شیڤەکێ چێکەین " د ڤی دەمی دا چا رلی پارەیێن ژ بەریکا ئولیڤەری ئینان دەر، دەمێ فاغنی پارە وەرگرتین، سایکی خو هاڤێت بەر گوت 'ئەو پارە یێن منن "
نەخێر ئەو یێن منن، تو پەرتوکا وەربگرە .
ئەگەر ئەو پارە یێن من نەبن، دێ ئولیڤەری زڤڕینم ڤە .
ئەڤە نابیتە کارەکێ باش .
باش بیت یان نە ، من و نانسیێ زاروکێ بو تە ئینای، وان پارا بدەمە .
پارە ژ دەستێ فاغنی ئینان دەر و کرنە د ناڤ دەستمالێ دا .
- ئەڤە حەق دەستێ مە یە، و نیڤا وان ژی تێرا مە ناکەت .
"ئەگەر تو حەز ژ خواندنێ بکەی، تو پەرتوکا وەربگرە، و ئەگەر نە بفروشە " . ئولیڤەر سەرچوکا مابوو، گوت "ئەڤە پەرتوکێن وی زەلامی نە، دەمێ ئەز نەخوش ئەز برم مالا خو،

چاڤدێرییا من کر، پەرتوك و پارا بدەنە وی، ئەز دێ مینم، دێ هزر کەن من یێن دزین،هێڤی دکەم بو وی بزڤرینن " ، فاغنی گوت " مافێ وی یە، دێ هزر کەن یێن دزین، ها ها ها، ژ ڤێ باشتر نەدبوو "، ئولیڤەر مەبەستا وان تێگەهشت، ڕابوو، گازی کر، "هێڤیەم هاریکاریا من بکەن" و ژ وێرێ ڕەڤی، یێن د ژوورێ ڤە ڕەهێلاییێ، نانسیێ دەرگەهـ گرت، " وی سەی بگرە، بیل دێ ڤی پارچە کەت"، سایکسی گوت " مافێ وی یە، ئەز دێ ل دویڤ چم، ڕابە نانسی، یان ژی دێ سەرێ تە ل دیوارێ دەم "، "نەخێر نەخێ، من بکوژە بەلێ نەهێلە ئەو سەیە چ ل زاروکی بکەت " سایکسی نانسی ل ئاخێ دا، وی دەمی فاغنی و زاروکێن دی ئولیڤەر ڕاکێشا ئینا، فاغنی گوت "چ ل ڤێرێ چێدبیت ؟"
ئەڤ کچە یا دین بووی .
نانسیێ گازی کر " نەخێر دین نەبوویە" . فاغنی گوت "بێ دەنگ بە "، پاش زڤڕی ئولیڤەری، دیارە تە ڤیا تو بچی ؟، مانە وەیە ؟ "، دارەك ڕاکر، " دێ باشە تە هاریکاری ڤیا، دا گازی پولیسا کەی " دێ نوکە بەرێ خو دەین چارەیەکێ . دار دانا ملێ ئولیڤەری، دا جارا دووێ دانیتێ، نانسیێ دەستێ دار ژ دەستا ئینا دەر و هاڤێت ناڤ ئاگری، گوت " ئەز بەرێ خو نادەم کارێن تە، تە زاروك دیت، تە چ دی دڤێت ؟"
بیل سایکسی گازی کر " بێ دەنگ بە "
فاغنی گوت نانسیێ "تو زێدەتر ب ئاخڤی، دێ تە ئێشینم " . دا نانسی چیت، سایکسی ئەو گرت، فاغنی گوت " ژنك ژی بەلا سەری نە، بەلێ بو ڤان کارا بو مە پێدڤی نە، چارلی ئولیڤەری ببە سەر تەختی " چارلی کەنی "ب هزرا من، سباهی وان جلکا نەکەتە بەر خو دێ باش بیت، تو چ دبێژی ؟"، فاغن ژی کەنی "راستە"، چارلی ئولیڤەر برە ژوورا دی، جلکێن وی ژ بەر کرن و یێن کەڤن کرنە بەر، ئولیڤەر ل تاریاتیێ هێلا ب نتێ، چارلی دەرکەفت .

## پشکا دەهێ

## داڕێشتنا پلانەکا نوی

دەمێ بامبلی، لبەر سوپێ روژنامە دخواند، شاش بوو، د ئاگەهداریەکێ دا دیار کربوو ئولیڤەر یێ بەرزە بووی، یێ ببینیت دێ 500 پاوند بو هێنە دان، ل دویماهێ ژی ناڤ و ئەدرێسێ بڕانلوی هاتبوو نڤیسین، بامبل چوو دەڤ بڕانلوی، بڕانلوی ب خێر هاتنا وی کر، بێدوینی گوت "من دزانی دێ ئولیڤەری بینین "، بڕانلوی گوت "تو دزانی ئولیڤەر ل کیڤە یە؟، هەڤالێ من هەمی تشتا دەربارەی وی بێژە "، بامبلی بیست خولەکا ب خرابی بەحسا ئولیڤەری بو وانا کر، هەمی تشت بو گوتن کا چە وا ڕەڤیە، بڕانلوی باوەری پێ ئینا، بەلی دلنەخوش بوو، بامبلی 500 پاوند وەرگرتن و چوو، بڕانلوی گوت بێدوینێ "ب هزرا من، هەڤالێ مە ئولیڤەر زاروکەکێ خرابە"

- ئەڤە وە نینە .

- ئەز دترسم راستە، بامبلی بو من هەمی تشت گوتن .

- ئەز چ جارا باوەریا خو ب ڤێ چەندێ نا ئینم، چ جارا، ئەز زاروکا تێدگەهم، ئولیڤەر زاروکەکێ، باشە، تێگەهشتی یە .

- بێ دەنگ بە، من نەڤێت گوهـ ل ناڤێ وی زاروکی ببم، تو دشێی دەرکەڤی، بێدوین، ئەز چ بێژم دێ ئەو هێتە کرن، جارەکا دی ناڤێ ئولیڤەری نەئینە .

ل وێ شەڤێ ل مالا بڕانلوی هەمی دلنەخوش بوون، هەروەسا ئولیڤەر ژی خەمگین بوو، بەلێ باشە نە دزانی کا بامبلی بو وان چ گوتیە، دا گەلەك خەمبار بیت، فاغنی حەفتیەکێ ئولیڤەر هێلا د ژوورا تاری ڤە، بو وی دگوت کا چەوا زاروکین ژ وی ڕەدڤین سێدارە دکرن، خوینا ئولیڤەری هشك دبوو، دەمێ گوە ل ڤان ئاخفتنا دبی، پاش فاغن دچوو، و ئەو ما ب تنێ، نەدشیا بچیت ژی، دەمێ هزرا خو د مالا بڕانلوی دا دکر، خەمبار دبوو، هزر دکر کا نوکە چەند هزرێن نەباش بو دکەن، ل شەڤەکا سار فاغنی دەرگەهەك مالەکا کەڤن قوتا، زەلامەکی گوت "کی یە ؟"

- ئەزم، بیل ب تنێ مە .

سایکسی گوت سەیێ خو، وەرە ڤێرێ، خو درێژ بکە ." ئێ فاغن ؟"

بەلێ، ئاخ نانسی !

نانسیێ کورسیکەك دایێ، گوتێ روینە خوار، فاغنی گوت نانسیێ " سارە، مروڤی سار دکەت "، سایکسی گوت فاغنی "تە گەلەك سارە ؟ "، داخواز ژ نانسیێ کر ڤەخوارنەکێ بدەتێ "، پشتی ڤەخواری، سایکسی گوت " دێ باشە، فاغن کارێ خو بێژە "، "بەحسا مالا ل چورتسی دکەم، دێ کەنگی چین وان زیڤا ئینین"

چ جارا نە .

تە گوت چ جارا نە ؟

ئەرێ، ئەڤە دوو حەفتیە، توبی کر یێکێت، یێ ل وان درا دگەڕیت، چ خزمەتکار ب دەست خو ڤە نە ئینانە .

ئانکوبیل، تو یێ دبێژی، چ خزمەتکارێن کور ب دەست خو ڤە نە ئینانە ؟

ئەرێ، ئەو هەر دوو خزمەتکارە ئەڤە بیست سالە پتر، یێ ل دەڤ وێ ژنکا پیر کار دکەن، چ جارا هاریکاریا مە ناکەن .

پا، خزمەتکارێن ژن، ما توبی وانا نابینیت ؟
بێ چارەیە، هەردەم توبی جلکێن جوان دکەتە بەر خو، لێ بێ مفایە .
دڤێت ئەم خو بدەینە پاش ژ ڤی کاری، بەلێ گەلەك نەخوشە، ئەم ژێ دویر کەڤین .
وەیە، شانسەکێ خرابە.
هەردوو بێ دەنگ بوون، نانسیێ بەرێ خو ددا ئاگری، بیلی گوت "فاغن، ئەگەر ئەم ڤی کاری ژ دەرڤە بکەین، دێ پێنچ هزار پاوندێن زێدە دەیە من ؟"
ئەرێ .
دێ باشە، چ دەمێ تە بڤێت دێ کەین، بەری چەند شەڤەکە، ئەز و توبی چووین د باخچەی دا، خانی ب شەڤ وەکی زیندانێ لێ دهێت، پەنجەرەکا بچویك یا هەی، بەلێ دڤێت زاروکەکێ نە مەزن بچیت د ژوور ڤە .
ئەو زاروکە، ئولیڤەرە، هەڤالێ من . دڤێت ئەو کار بکەت، دا نانێ خو بخوت .
ئەرێ، ئولیڤەر بو ڤی کاری یێ باشە .
دێ هەمی کارێن مە بڤێت، کەت، وی بترسینە.
تە گوت ترساندن، دا ئەم دەست ب ڤی کاری بکەین، دێ زانم، چەوا ترسینم .
دڤێت ئەم وی وەلێ بکەین، هزر بکەت، هەتا مرنێ دێ ل دەڤ مە بیت، و ئەو دزیکەرەکە.
تو بوچی بو زاروکەکی هند خەما دخوی ؟، ل سەر جاددا تژی زاروکن،یێ تە بڤێت دێ ژێگری.
ئەو ب کێر کارێ من ناهێن،زاروکێن دی دزیکەرن بەلێ ئەو وەسا نینە دڤێت ئەو ببیت ئێك ژ مە
نانسی – دێ کەنگی ڤی کاری کەین؟
سایکس – دوو شەڤێن دی .
فاغن – باشە، وێ شەڤێ هەیڤ نینە .
بڕیار هاتە دان، نانسی شەڤەکا دی بچیتە ئولیڤەری بینیت وێرێ، پاش فاغن دەرکەفت .

## پشکا یازدێ

## ئولیڤەر و سایکس

دەمێ ئولیڤەر ل سپێدێ ڕابووی، سولەکا نوی دیت، کەیفا وی گەلەك هات، بەلێ ل دویڤدا دەمێ فاغنی گوتیێ "دێ ئەڤ شەڤە چین دا تو سایکسی ببینی "، دلنەخوش بوو، ب دەنگەکێ ترس ڤە گوت " دا ئەز بمینم ل وێرێ، ئەزبەنی؟"،
نەخێر، نەخێر، مە نەڤێت تو بچی،نە ترسە، دیسا دێ هێی دەڤ مە .
دێ بوچی چم ؟
راوەستە، بلا بو تە سایکس بێژیت .
زەلامێ پیر، هەتا چووی ژ دەرڤە بێ دەنگ بوو، گوت ئولیڤەری "دێ شێی شەمالکەکێ هەلکەی ؟، تا ئەو هاتین دا تو بخوینی، ڤێ پەرتوکێ وەربگرە، های ژ خو هەبە ئولیڤەر، سایکس کەسەك رەڨە، دەمێ توره دبیت، کەسێ نا نیاسیت، چ بێژیتە تە وەکی وی بکە، شەڤا تە بمینیت خوش" . ئولیڤەری دەست ب خواندنێ کر، د پەرتوکێ دا بەحسا کوشتن، دزیکەر و کەلەخا دکر، گەلەك ب ترس بوون، ژ ترسا ئولیڤەر نەخوش بوو، پەرتوك هاڤێت، دوعا ژ خودێ کرن، ل دویڤدا دەنگەك هات، نانسی بوو، نانسی سپی ببوو، دەستێ خو دانە بەر رویێ خو .
ئولیڤەری گازی کر "نانسی، چ چێبوویە ؟"
چ نینە، نوکە تو ئامادەیی ؟، دا بچین دەڤ بیلی، بێ دەنگ بە ل دەڤ وی، ئەگەر نە، دێ زیانێ گەهینیتە تە ، و من، دێ دەستێ خو بدە من، دا بچین بلەز .
دەمێ چووین مال، سایکسی گوت "دیارە تە ئینا، ب رحەتی هات ؟"
وەکی بەرخکا.
یا باشە، وەرە ڤێرێ، دێ لگەل تە ئاخڤم .
سایکسی کومکێ ئولیڤەری ژ سەری کر و هاڤێت، پاش دەبانجەکا ل سەر میزێ ڕاکر، "نوکە بێژە، تو دزانی ئەڤە چی یە ؟"
بەلێ ئەزبەنی .
پاش سایکسی دەبانجە تژی کر، دەمێ خلاس بووی .
نوکە دەبانجە تژی یە .
بەلێ، ئەز یێ دبینم .
دەبانجە کرە د سەرێ ئولیڤەری را، گوتێ "باشە "
ژ دەرڤە، دەمێ ئەز تشتەکی بێژم تە، چ نە، بەلێ ژ بلی هندێ، تو تشتەکی بێژی ئێکێ دێ تە کوژم، تێگەهشتی ؟، نوکە وەرن، دا ئەم شیڤێ بخوین ژ بەری کاری .
نانسیێ خوارن ئامادە کر، دلێ ئولیڤەری نەدچوو خوارنێ، پشتی خوارنێ سایکسی، گوتە نانسیێ "دەمژمێر پێنجێ من ژ خەو ڕاکە"، نانسی روینشت خوارێ ل بەر سوپێ، ئولیڤەر هشیار ما، پاش نڤست . دەمێ ڕابووی ڕوژ نە دەرکەفتبوو ، شەمالك هەلبوو، باران دهات و ئەسمان تژی ئەور بوو . سایکسی گوت " دەمژمێر پێنج و نیڤە، لەزێ بکەن، یان ژی هوین تێشتێ ناخون، درەنگە"، پشتی دەمەکێ کێم، ئولیڤەر ئامادە بوو، سایکسی خاترا خو ژ نانسیێ خواست، لگەل ئولیڤەری دەرکەفتن، ژ دەرڤە کەش یێ ساربوو، گەلەك باران دهات، پەنجەر ێن

هەمی مالا گرتی بوون، جاددە ڤالا بوون . سایسکس و زاروك بلەز دەرکەفتن   ژ باژێری، دەمێ چووین رێکا گوندی، روژ دەرکەفتبوو، پاش چوون گوندەکی بچویك، چوون د خانیەکێ کەڤن ڤە، سایسکی خوارن خواست، پشتی خوارنێ وی قەلینا خو کێشا، ئولیڤەر ژ وەستیانێ نڤست . دەمێ ژ خەو ڕابووی، تا ری ببوو، سایکسی دەستێ خو لێدا و ڕابوو، برێڤە چوون، شەڤەکا گەلەك سار بوو نە دئاخفتن . هەتا روناهیەکا گوندی دیتین برێڤەدچوون د ناڤ بیستانا دا،  هاتن دەڤ پرەکێ، سایکسی زڤڕی، چوون بەر لێڤا ئاڤێ . ئولیڤەر چ نەمابوو، دا ژ ترسا دلگرتی بیت، د دلێ خو دا گوت "ئاڤە، ئەز یێ ئینایم ڤێرێ دا من بکوژیت"، پاش دیت یێ ل بەر دەرگەهێ مالەکێ راوەستیاین، مالەکا کەڤن  و  نیڤ هەڕفتی،  چ روناهی تێڤە نەبوون، سایکسی دەرگەهـ ڤەکر و چوونە ژوور . دەمێ چووین ژوور، ئێکی ب دەنگێ بلند گوت " سلاڤ "، سایکسی دەرگەهـ گرت و گوت "وەسا دەنگی نەکە، روناهیێ هەلکە توبی"، کەسەك د دەستی دا شەمالك ڤە دەرکەفت، پرچا سور، پێلاڤەکا مەزن و تبلێن وی ژ گوستیرکێن مەزن تژی بوون .

توبی کرێکیت – دلخوشبووم ب دیتنا تە، بیل . ئەڤە ئەو زاروکە .

سایکس – ئێکە ژ کورکێن، فاغنی .

توبی بەرێ خو دا ئولیڤەری، "چ زاروکەکێ تەنایە، ژ بو وان خانمێن پیرێن دێرێ ژی باشە "

سایکس – دێ، بو مە خوارنەکێ بینە .

توبی بەرێ خو دا ئولیڤەری و گوتێ روینە خوار، ل بەر سوپێ، دڤێت ئەڤ شەڤە تو لگەل مە بهێی ژ دەرڤە، ئەم گەلەك دویر ناچین . ئولیڤەری بەرێ خو دا سایکسی، روینشت بوو خوارێ بێی کو بزانیت کا ل کیڤە یە و چ ل وێرێ چێدبیت، ژ بلی پاریەکی نانی چ تشت نەخواربوو .

هەردوو زەلام پیچەکێ نڤستن، ئولیڤەر ژی نڤست، د خەونێن خو دا ئەو رێکێن تاری و نەخوش ددیتن، پاش توبی ژ جهێ خو ڕابوو، " دەمژمێر ئێك و نیڤە،  چەك ئامادەنە ؟، و کلیل، مە چ ژ بیر نەکریە ؟" سایکسی گوت "هەمی تشت یێ ل ڤێرێ، نوکە، دا بچین گوندی، دەستێ ئولیڤەری بگرە، توبی دێ چین" .

## پشکا دوزدێ

## سەرەدان بو چورتسێ

هەردوو دزیکەرا ئولیڤەر کرە د ناڤ بەینا خو دا و چوون، ژدەرڤە سار و تاری بوو، چوون بەرەڤ روناهیا ژ بەری نوکە دیتی ن، سایکسی گوت " دێ راست چین ، ئەڤ شەڤە کەس مە نابینیت"، دناڤ گوندی ڕا جوون، دەمەکی ل بەر دەرگەهێ مالەکێ ڕاوەستیان، توبی چوو سەر دیواری، گوت"پشتی من دێ ئولیڤەر هێتە سەر دیواری، بو من بینە دا وەربگرم "، ئولیڤەر ژ لایێ سایکسی ڤە هاتە ڕاکرن بو توبی، بەرەڤ مال ڤە چوون، ئولیڤەری ددیت یێن دچنە مال ڤە ترسیا، بو دزیێ بەلکی ژی بو مرنێ، ڤێریەك ڤەدا و کەفتە سەر چوکا، سایسکی ب تورەیی ڤە دەبانجە کرە د سەری ڕا، گوتێ "ڕابە، یان ژی دێ تە کوژم "

هێڤی دکەم ، من بەردەن، دا بچم بلا بمرم ل ڤێرێ، چ جارا ئەز نێزیکی لەندەن ژی نابم، چ جارا، دلێ هەوە بلا ب من ڤەبیت، دزیێ ب من نەکەن !

سایکسی دەبانجە کرە د سەڕی ئولیڤەری را، توبی ژێ وەرگرت و دەڤێ ئولیڤەری گرت، "بێ دەنگ بن، ئەگەر کورك جارەکا دێ ئاخفت، دێ کوژم، توبی و سایکسی ئولیڤەر برە پشتا خانی، پەنجەرەك بچویك هەبوو ل وێرێ، سایسکی ڤەکر، ئولیڤەر دا تێرا چیت . سایکسی روناهیەك ژ بەریکا خو ئینا دەر و دا ئولیڤەری، "نوکە گوهێ خو بدە من، دێ تە کەمە ژوورڤە، ڤێ روناهیێ وەربگرە، هەرە دەرگەهی ڤەکە " توبی خو چەماند و سایکس جوو سەر پشتا وی، ئولیڤەر کرە ژوورڤە .

ـ ڤێ روناهیێ وەربگرە، تو دەرێجا دبینی ؟

ـ ئەرێ (ئولیڤەر وەکی مریا بوو).

سایکسی ب تبلا خو دەرگەهـ نیشا دا، "ئەگەر تو دەرگەهی ڤەنەکەی، دێ تە کوژم، نوکە هەڕە"، ئولیڤەری بڕیار دابوو، دا چیت سەری و خێزانێ ژ خەو ڕاکەت، چوو پێشڤە، سایکسی ب دەنگەکێ بلند گوتێ "بزڤرە، بزڤڕە "، ب ڤێ ترسێ روناهی ژ دەستێ ئولیڤەری کەفت، روناهیەك هات دیتن، ئولیڤەری زەلامەك دیت، دویکێلەك دیار بوو ، ئولیڤەر کەفت، ئێکی تەڤە لێ کربوو، سایکسی ئولیڤەر گرت، تەڤە ل کەسێن دی ژی کر، ئولیڤەر ژ پەنجەرێ ڕا دەرئێخست، سایکسی گوت توبی "چاکیتەکی بدە من، تەڤە ل وی کرن، خوین نامینیت "، وی دەمی دەنگێ زەنگلەکێ هات، زەلاما گازی دکر، ئولیڤەری هەست کر یێ دهێتە ڕاکێشان ل سەر ئەردی، پاش تشتەك گوهـ لێ نەبوو، چاڤێن وی تاری ببو ون، سایکسی ئولیڤەر دانا سەر چوکێن وی، پاش گازی توبی کر " وەرە ڤێرێ، هاری من بکە، دا ڤی زاروکی ڕاکەی "، توبی دهات، سایسکی ژ بەریکا خو دەبانجە ئینا دەر، گازی کرێ "بلەز وەرە"، دەنگەك هات، ئەو زەلامە دهاتن، سەیێ وان ژی لگەل وان بوو . توبی گوت " یێن ل دویڤ مە ڤە، دویماهیا مە یە "، توبی خو بەرزە کر، سایکسی ژی ژ وێرێ ڕەڤی، هەر دوو زەلام هاتن ئێکی گوت "ئەو چوون، دا ئەم بزڤڕین " یێ دی گوت "ئەرێ، گیلز "، سپی ببوو . یێ ئێکێ گوت " تو یێ دترسی"، ئەو خو ژی دترسیا، "ئەم هەردوو یێن دترسین، بەلێ ئەڤە گەلەك سروشتی یە " بەلێ ئەگەر مە ئەو دزیکەر گرتبان، دا کوژم وانا"، پاش هەر دوو چوون مال . دەمێ روژ

دەركەفتی، كەش ژی سار بوو، گەلەك باران دهات، ئولیڤەر بێی تشتەكی گوهـ لێ ببیت و بزانیت، ل جهێ تەر نڤستی بوو .

## پشکا سێزدێ

## دووباره ڕزگاربوون

ئولیڤەری های ژ خو هەبوو، کەتبوو سەر دەستێ خو ێێ چەپێ، ئەوێ بریندار بووی، پاش رووینشت خوارێ، گازی کر، نەدشیا ڕابیت، کەفتە سەر پشتێ، ئولیڤەری دزانی دێ ل وێرێ مریت . پشتی دەمەکی ڕابوو و رێڤەچوو . وەکی سەرخوشا بوو . نەدزانی دێ چیتە کیڤە ؟، باران دهات، چوو سەر رێکەکێ و مالەك دیت . د دلێ خو دا گوت "بەلکی یێن ل وێ مالا هە، من بحەوینن، ئەگەر نە باشترە ئەز ل دەڤ مروڤا بمرم "، هەست کر وی جارەکا دی ئەو مالە یا دیتی، هاتە بیرا وی، شەڤێدی دوعا کربوون ل دەڤ وان دزیکەرا دا وی نەکوژن . دەمێ هاتی بیرا ئولیڤەری برینا دەستێ خو ژبیر کر . نوکە بتنێ هزرەك دکر ڕەڤین، ڕەڤین ؟، نەدشیا برێڤە بچیت . چارە نەبوو، ما دا کیڤە ڕەڤیت ؟، دەرگەهێ باخچەی ڤەکر و چوو ژوورڤە، پاش ژ ترسا کەفت . وی دەمی خزمەتکارێن مالێ ل لێنانگەهێ چای ڤەدخوار، گیلزی چیروکا ش ەڤێدی بو دگوت . دەرگەهـ هاتە لێدان، ترسیان، "کی یە ڤێ سپێدێ دەرگەهی دقوتیت ؟"، هەمیا سە دانا پێشاهیا خو و دەرگەهـ ڤەکر، دیتن زاروکەکێ گەلەك بێ سەروبەر یێ ل بەر دەرگەهی، گیلزی گازی کر "زاروکەکە "، ئولیڤەر ژ دەستێن وی گرتن و برن ە هولێ . گازی نهوما سەری کر "ئەڤەیە، یێ ل ڤێرێ، ئەڤە ئێك ژ وان دزیکەرانە، من تەقە ل وی کر "، خانمەکێ ژ سەری گازی کر "گیلز"، گیلزی گوت "ئەز یێ ل ڤێرێ، ئەزبەنی، نە ترسن، من دزیکەرەك یێ گرتی "، خانما گەنج گوتێ " بێ دەنگ بە، تو ژی وەکی دزیکەرا دێ مەتا من ترسینی، ژاری بریندار بوویە ؟"، گیلز ـ بەلێ، رەوشا وی گەلەك خراب .

خانما گەنج ـ وە دیارە گەلەك یێ بریندار بووی، دێ مریت .

گیلز ـ خانم ئەگەر تە بڤێت وەرە بەرێ خو بدەیێ ل خوارێ .

خانما گەنج ـ من گوت هەوە بێ دەنگ بن . دێ بێژم مەتا خو دا کا دێ چ کەین .

چوو ژوور و هات، گوتێ "ببەن ژوورا گیلزی "، بلا بریلتز هەسپەکی ببەت و نوژدارەکی بینیت. گیلزی هەر وەکی چویچکەك بریندار کری، ب شانازی ڤە گوت "ئەزبەنی، تە دڤێت تو دزیکەری ببینی"،"نە نوکە، نە نوکە !"، "ژاری باش بەرێ خو بدەن وی، گیلز " خانما گەنج زڤڕی ڤە، پاش گیلزی ئولیڤەر برە ژوور .

## پشكا چواردێ
## مالەكا نوی

ل ژوورەكا خوش و ئارام، دوو خانما تێشت دخوار، گیلزی ب جل و بەرگێن رەش ڤە، خوارن بو دئینا . خانمەك پیر بوو یا دی نەگەهشتبوو هەڤدە سالیێ . چاڤشین بوو، ناڤێ وێ روز مەیلی بوو، ناڤێ مەتا وێ ژی خانم میێلی بوو . مەتا روزێ گوتێ " بوویە دەمژمێرەك بریلتز چووی مانە وەیە ؟"، گیلزی گوت "دەمژمێرەك و بیست خولەك "، "هەردەم یێ گیرویە ئەڤ زەلامە "، گیلزی گوت " ژ بچویكاتی خو وەرە وەسانە "، بریلتز ئەڤە سیهـ سالە ل ڤێ مالێ كار دكەت . ل ڤی دەمی ترومبێلەك ل بەر دەرگەهێ مال ڕاوەستیا، زەلام ەك ڤەلەو هاتە ژوور گەلەك بلەز چ نەما بوو دا خو ل مێزا خوارنێ دەت، گوت " من د ژیانا خو دا تشتەك وەسا گوهـ لێ نەبووێ، دیارە شەڤێدی دزیكەرەك یێ هاتی، هوین دا ژ ترسا مرن "، روزێ گوت "ئەم باشین، دكتور لوزبوێن، ل سەری زەلامەك یێ هەی، مەتا من دڤێت هوین وی ببینن" ، دكتوری گوت "بریلتزی بو من گوت، گیلز تە تەڤە لێ كر، ل كیڤە یە ؟، رێكێ نیشا من بدەن، دێ هەوە بینم خانم مێیلی"، چوون سەری، د دەمەك درێژ مانە د ژوورڤە، پتر ژ دەمژمێرەكێ، خزمەتكار ژی دچوون سەری دهاتن خوارێ . پاش دكتور هاتە خوارێ، گوتە خانما " تشتەكێ سەیرە خانم مێیلی "

- دخوازم رەوشا دزیكەری خراب نەبیت ؟
- ئەز هزر ناكەم، هەوە ئەڤ دزیكەرە دیتیە ؟
- نەخێر .
- هەوە چ تشت گوهـ لێ نەبووینە دەربارەی وی .
- نەخێر .

گیلز – دەمێ دكتور هاتی، دا بو هەوە بەحس ژێ كەم، گیلزی شەرم دكر، بێژیت من تەڤە یا ل زاروكەكی كری.

خانم مێیلی – دا روز بەرێ خو دەتێ، من رێك نەدایێ .

دكتور – تشتەكێ خراب نینە، نوكە باشە، دەمێ ئەز ل ڤێرێ هەوە دڤێت هوین وی ببینن .

خانم مێیلی – ئەگەر پێدڤی بیت .

چوونە نهوما سەری، نوژداری دەرگەهـ ڤەكر، گوت " هوین چ هزر دەربارەی وی دكەن "، وانا هزر دكر، دزیكەرەك خرابە، بەلی زاروكەك بوو، نەخوش بوو، نڤستی بوو . هەمیا بەرێ خو دایێ، پاش روزێ پرچا وی ڕاكر، دەمێ وەكری روز دگری، روندكێن وێ كەفتنە سەر رویێ ئولیڤەری، ئولیڤەر د خەودا گرنژی . خام مێیلی گوت "ئەڤە چی یە؟، ئەڤ زاروكە نابیتە دزیكەر" .

نوژداری گوت " كی دبێژیت ؟، خرابی گەلەك جارا ل مالەكا جوان دبیت، مرن ل دەڤ پیرا لدەڤ گەنجا ژی دبیت "

روز – بەلێ، ل ڤێ ژیێ هندە بچویك، بەلكی ڤی زاروكی، چ جارا مالەكا خوش نەدیتیە، مەتێ، بلا دلێ هەوە بمینیت پێڤە، ئەز رێكێ نادەم ڤی زاروكی ببەنە زیندانێ .

مێیلی – ئەز رێكێ نادەم، زیان بگەهەیتە ڤی زاروكی، دخوازم خودێ دلوڤانیێ ب من ببەت، كا جەوا ئەز دلوڤانیێ ب هندەكێن دی دبەم .

ئوليڤەر بو دەمێن درێژ ما نڤستی، بوو شەڤ، ئوليڤەر ڕابوو ژ خەو، چيروكا خو بو گوت، گەلەك نەخوش بوو، بو وانا گوهـ ل سەرهاتيێن ئوليڤەری ببن يێن ب ژان، بێ دلوڤانيا مروڤا . بەلێ مروڤێن باش ژی هەبوون . ئوليڤەر ئارام ببو، د دەمەكێ كێم دا ساخ بوو، سوپاسيا خانما كر، روژەكێ گوتە روزێ" من دڤيا هاريكاريا هەوە بكەم "، روزێ گوتێ " دێ نێزيك چينە گوندێ، مەتا من دڤێت تو بهێی، دێ هاريكاريا مە كەی، ل باخچەی" ،ل گوندی هەمی دلخوش بوون، ژيانەكا نوی بوو بو ئوليڤەری، ئوليڤەری گوهێ خو ددا سترانێن روزێ ب پيانويێ، وانە ژی دخواندن، سێ هەيڤ بورين، هەيڤێن ب خوشی و دلخوشی، ئوليڤەر ب ڕاستی دلخوش بوو . ئەو خانمێن خودان دكرن، مروڤێن باش بوون، ئوليڤەری ژ دلی خو حەز ژ وانا دكر .

## پشکا پازدێ

## ڕویدانەکا سەیر

بهار زوی دچوو، بوو هاڤین ، ئولیڤەر ب هیز دبوو و روژ بو روژ دلخوش دبوو. روژەکێ چوبوون گەڕیانەکا درێژ، پاش ل شەڤ زڤڕین ڤە ، روز روینشته سەر پیانویێ، پیانو ژەنی، دەمەکی رویێ وێ سپی بوو، دەستێن وێ لەرزین، خانم مێیلی گا زی کرێ " چ ل ته هاتیه روز ؟"، روزێ گوت "چ نە، مەتێ ئەز پیچەك وەستیایمە، دێ نوکە نڤم، سباهی دێ چێبم"، ل سپێدێ روز نەباشتر لێ هاتبوو . دیار بوو نەخوشیەکا نەباش یا لێ . ئولیڤەری گوت "دا گازی نوژدار لوزبێرنێ بکەین"، مەتا وێ گوتێ "من نامە یا بو نڤێسی . ئەگەر د ناڤ بیستانا ڕا بچیت، دێ گەهیت چورسی، ئولیڤەر دێ شێی ڤێ نامی ببەی؟"، ئولیڤەر نامە وەرگرت و چوو . دەمێ چووی گوندی، ل خانی گەڕیا،دیت، نامە ڤڕێکر بو نوژداری، دەمێ دەرکەفتی . زەلامەکێ بەژن درێژ چ نەمابوو، دا ئولیڤەر ڤێ کەڤیت، زەلامی بەرێ خو دایێ گوت " ئەڤ شەیتانێ بچویك ژ کیڤە دەرکەفت؟"، ئولیڤەری گوت "ببورە، ئەز گەلەك بلەزم، دڤێت ئەز بچم مال، من تو نەدیتی"، زەلامی بەرێ خو دا ئولیڤەری گوتێ " دەهبە، کێ دزانی دێ ژ تابوتێ دەرکەڤیت و هێته رێکا من؟"، ئولیڤەری ژ ترسا گوت " ببورە"

دخوازم، من تو نە ئێشاندبی .

نەفرەت لێ بن، خودێ سزایێ ته بدەته ته، تو بمری، تو ل ڤێرێ چ دگەڕی ؟

دا زەلام چیته ئولیڤەری قوتیت، پاش کەفته ئ ەردی، ئولیڤەری هزر کر زەلام یێ دینە، دا هاریکاریا وی بکەت چوو خانی ڤە، هندەکا زەلام برە ژوور، ئولیڤەر ژی بلەز چوو . دەمی چووی مال ژ بیر کر ئەو زەلامە، جونکی روز گەلەك نەخوش ببوو ، هزر دکر دێ مریت . ل وێ شەڤێ درەنگ نوژدار ل وزبێرن هاتە مال، نوژدار دەرکفەت گوت "گەلەك یا گەنجە، بەلێ ئومێد کێمن"، روژ دبورین کەس نە دئاخفت، خەلکێ گەلەك حەز ژ روزێ دکر، بو دگرین .

ئولیڤەر روژەکێ چوو دێرێ و دوعا بو کرن ، دەمێ چووی مال خانم مێیلی ل ژوورا خو بتنێ روینست بوو، ئولیڤەر پرسیار ژ خو کر "هەردەم یا ل ژوورا روزێ بوچی نوکە بتنێ یە ؟"، ئولیڤەری زانی روز یا بو دەمەکێ درێژ یا نڤستی، یان دێ چیبیت، یان ژی دێ مریت . بو دەمەکێ درێژ ئولیڤەر و خانم مێیلی بێ دەنگ بوون، نوژدار هاته ژوور . مێیلیێ گازی کر "چەوانە بو من بێژە ؟"

ئارام بن، هێڤی دکەم.

بو من بێژە، نوژدار، هێڤیا دکەم، یان ژی روز مر ؟، دێ مریت ؟

نەخێر .

ب ئانەهیا خودێ نامریت، دێ بو دەمەك درێژ ژیت .

خانم مێیلی دوعا کرن، گەلەك رویدانەکا دلخوش بوو . ئولی ڤەر نەگری و نە ئاخفت، نە د ڕاوەستیا . دەرکەفت دا گولا کوم بکەت بو تەختێ روزێ . روز روژ بو روژێ ساخ دبوو . بەلێ نەدهات ژ دەرڤە . ئولیڤەری ژی د ژوورا خو بچویك ڤە وانە دخواندن . د روژەکا هاڤینێ یا گەرم دا، ئولیڤەری پەرتوك دخواندن، و نڤست، ئولیڤەری خو د ژوورا فاغنی دا دیت، فاغنی بەحسێ ئولیڤەری بو زەلامەك دی دکر، ئولیڤەر ڕابوو ژ سەر جهێ خو . گوت "خودێ، ئەڤە چ بوو ؟"،خوینا وی هشك بوو ل بەر پەنجەرێ فاغن و ئەو زەلامێ ل بەر خانی دیتی، ل وێرێ

بوون، ئێك و دوو دیت، پاش بەرزە بوون، ئولیڤەر سپی بوو، ژ بەر نەفرەت و كەربێن وانا ، ئولیڤەر ڕاوەستیا، پاش ژ پەنجەرێ دەركەفت و گازی كر " هەوارە "، خزمەتكار هاتن دەڤ، ئولیڤەر گازی دكر "فاغن، فاغن ! "، گی‌لزی دارەك ڕاكر و گوتێ " تە چ دیت،زەلامەك ؟، چوو كیڤە؟"، ئولیڤەر گوت "ڤی لای، خزمەتكار هەردوو چوون، نوژدار ژی لگەل وانا، بەلێ بێ مفا بوو، بەرزە ببوون .

نوژداری گوتە ئولیڤەری "دیارە تە خەونەكا دیتی ؟"

نەخێر، ئەزبەنی، من فاغن  و زەلامەك دیتن دیت، ئەز ژێ پشرت ڕاستم، دوو بوون .

یێ دی كی بوو ؟

ئەو زەلامی دا من قوتیت ل خانی، من ئەو نیاسی .

ئەڤە تشتەكی سەیرە .

ل وانا گەڕیان ڤە، بەلی كەس نەدیتن، ل روژا پاشتر گیلز ل جهێن دەوروبەر ل وان گەڕیا، بەلێ كەسێ نە دیتبوون . ل روژا دی تر، ئولیڤەر لگەل نوژداری چوون باژێری، بەلێ  سەرەدان   ا فاغنی و وێ كەسی هەر ما ڤەشارتی .

## پشکا شازدێ
## بامبل و یێ بیانی

ئەو مالا ئولیڤەر لێ بووی، بامبلی چای ڤەدخوار و روژنامە دخواند، وی دەمی کەسەك هات وی ببینیت، ئەو زەلامە بوو یێ لگەل فاغنی چووین بەر پەنجەرا مالا ئولیڤەر لێ، یێ بیانی گوت
"ب هزرا من ئەز تە دنیاسم، بەرێز بامبل تو ل ڤێرێ کار دکەی، مانە وەیە ؟"
نوکە ئەز سەروکێ ڤێرێ مە، گەنج .
گوهێ خو بدە من، من دڤێت تو تشتەکی بێژی من .ڤان وەرگرە "دوو سێ پاوند هاڤێتن سەر مێزێ، بامبلی کرن د بەریکا خو دا .
تشتەکی بینە بیرا خو بەرێز بامبل، ژ بەری دوازدە سالا ل وەرزێ زڤستانێ .
ئەڤە ژ مێژەیە .
وێ زڤستانێ، تشتەك چێببوو، زاروکەك ژ دایك ببوو .
گەلەك زاروك ل ڤێرێ دبن .
ئەز بەحسا ئێکی دکەم، کورەك بوو، ل دەڤ تابوت چێکەرەکی کار دکر، پاش رەڤی .
ها!، تو بەحسا ئولیڤەری دکەی، ئەو زاروکەکێ خراب ....
یا من دڤێت بزانم، خوزی وی تابوتا خو چێکربا و چووبا تێدا، نەخێر، یا من دڤێت بزانم ئەو ژنکا بەرێ خو ددا دەیکا ئولیڤەری، ل کیڤە یە ؟
ئەو، یا مری ژ بەری سالەکە .
یێ بیانی هزرێن خو کرن، پاش رابوو دا چیت، بامبلی گوتێ "راوەستە، دەمێ ئەو ژنکە مری، هەڤالەکا وێ لگەل بوو، ژنکەکا دی، بەلکی ئەو هاریکاریا تە بکەت "
دێ چەوا وێ بینم .
ب رێیا من .
کەنگی ؟
یێ بیانی لاپەرەك ئینا دەر و تشتەك ل سەر نڤێسی، "ل دەمژمێر نەهی شەڤ، بو من بینە ڤی ئەدرێسی" . و دەرکەفت، بامبلی بەرێ خو دا لاپەری چ ناڤ ل سەر نەبوون، بامبل ل دویڤ را چوو، دەستێ وی گرت، "تە چ دڤێت ؟"
من دڤێت بتنێ پرسیارەکێ ژ تە بکەم، دێ ب چ ناڤ گازی تە کەم .
مونکس .
شەڤەکا گەرم بوو ل هاڤینێ، بامبل چوو جهەکێ ل بەر رویباری ، ژنکەك لگەل بوو، بامبلی بەرێ خو دا ئەدرێسی گوت "دێ ل ڤارا بیت "، ژ مالەکا کەڤن دەنگەك هات "سلاڤ، وەرن ژوور "، زەلامێ جلك رەش دەرگەهـ ل پشت وان گرت .
مونکس - بامبلی گوت دەمێ ژنکەکا پیر مری تو ل دەڤ بووی، ب هزرا من تشتەکێ ڤەشارتی یا بو تە گوتی، تو چ دبێژی ؟
ژنکا پیر – بەلێ بەحسێ دەیکا ئولیڤەری کر، ئەڤە راستە .
چ گوت ؟
بامبل – بهایێ وێ بو تە چەندە ؟
بەلکی چ بها نەبیت،یان ژی بیست پاوند، دا ل دەستپێکێ گوهێ خو بدەینی .

پێنچ پاوندێن دی ژی بدە من، بیست و پێنجا، دێ ئەز بهایێ ڤێ خانمێ دەمێ .
بیست و پێنج پاوند !!
ئەرێ، گەلەك نینن .
مونكسی گازی كر، "بەلكی دەمی دبێژیت، بێ بها بیت، ئەڤە دوازدە سال بورین، گەلەكە .
یان دێ پێ رازی بی، یان ژی دێ لێڤە بم .
مونكسی هزرێن خو كرن، پاش پارە ژ بەریكا خو ئینان دەر و بیست و پێنج پاوند دانێ، گوت "نوكە، دا گوهێ خو بدەینە چیروكێ"
ژنكا پیر – دەمێ سالی مری، ئەز و ئەو ب تنێ بووین .
مونكس – كەس دی ل وێرێ نەبوو، كەسێ گوهـ لێ نەبوو، یا هوین د ئاخفتن ؟
- نەخێر .
- باشە، بەردەوام بە .
- بو من بەحسێ كچەكا گەنج كر، كچەكا ژ بەری چەند سالەكە زاروكەك بووی، ئەڤە ئەو زاروك بوو، یێ بامبلی ناڤێ وی كری ئولیڤەر تویست . وێ ژنكێ گوتە من، دەمێ ئەڤ كچكە مری، تشتەك یێ دای من، دەمێ مری هێڤی ژێ كربوون وی بدەتە زاروكێ وێ .
- مونكسی ( ب دەنگەكێ بلند ڤە )، وێ ڤەشارتە، چ لێ كریە ؟
- یێ بو خو ڤەشارتی، نەدایە زاروكی .
- پاشی ؟
- پاشی، ئەو فروتە من دێ ژ مالا بێ هێزا چووی .
- ئەو نوكە ل كیڤە یە ؟
"ئەڤەیە"، زەرفەك هاڤێتە سەر مێزێ، مونكسی ڕاكر، تێدا هژمارەكا موییێن پرچێ، مەدالیەكا زێری و خەلەكەك تێدا بوون . ژنكا پیر گوت " ل سەر گوستیركێ یا نڤێسی، ئاگنێس . ئەڤە ناڤێ دەیكا زاروكی یە "، مونكسی گوت " ئەڤە بتنێ نە؟"،"ئەرێ"، بێ دەنگ بوون، بامبل بێ دەنگ بوو ژ سەری تا وی دەمی، بامبلی گوت "دێ شێم دوو پرسیارا كەم ؟ "، مونكسی گوت "ئەرێ، بەلێ دێ كارێ من بیت كا دێ بەرسڤ دەم یان نە "
یا ئێكێ، ئەڤە بوو یا تو ل هێڤیێ ببینی ؟
ئەرێ .
یا دووێ، دێ چ ل كەی ؟ دژی من بكار ئینی ؟
چ جارا، نوكە ل گەل من وەرە دێ بێژم تە كا دێ چ لێكەم ؟
هەر دوو چوون سەر رویباری ، باران ژی هات ، مونكسی پوشێت هاڤێت رویباری گوت "ئەڤەیە، دویماهیا چیروكێ، چ تشت نەما بهێتە گوتن، و هوین دێ بی دەنگ بن باشە " بامبلی خو چەماند گوت "دێ شێن باوەریا خو ب من ئینن، بەرێز مونكس "، مونكسی گوت " دلخوش بووم، نوكە تو ب خێر بچی، ژ ڤێرێ هەڕن بلەز "

## پشکا هەڤدێ

## نانسی نەپەنیا دزانیت

سایکس نەخوش بوو، ئەڤە چەند حەفتیەکە کەفتبوو ناڤ جها، ل بەر پەنجەرێ کچەکا گەنج روینشتبوو، وەسا یا بێ رەنگ بوو، کەسێ باوەر نەدکر، ئەڤە نانسی یە .
نانسی – تو ئەڤ شەڤە چەوانی، بیل ؟
بیل – ئەز بێ حالم، پیچەك ئاڤێ .
دەرگەهـ ڤەبوو، فاغن هاتە ژوور، چارلی و دووکینس ژی ل دویڤ ڕا هاتن، د دەستێ وان دا کارتونەك هەبوو، سایکسی ب شاشی ڤە بەرێ خو دا وان، گوتێ "کیژ بایێ خراب هوین ئینان ڤێرێ؟"، فاغنی گوت "چ بایێ خراب نینن، من بو تە تشتەکێ ئینای تو پێ باش ببی، دووکینس کارتونێ ڤەکە و وان تشتا بو بینە دەر یێن مە هەمی بو مەزاختین"،دووکینسی کارتون ڤەکر، و چارلی دانان سەر مێزێ، چارلی گوت " گوشتەکی خوش، بیل، شەکر، نان، پێنیر، و شیشەکا مەیێ، ڤەخوو"، بیلی ڤەخوار، فاغنی گوت "باشە، ئەز یێ تەدبینم تو باشی"، بیلی گوت "باشتر، تو بو هاریکاریا من تبلا خو نا لڤینی، ئەڤە سێ حەفتیە تە پرسیارا من نەکری "، فاغنی گوت " بەرێ خو بدەنێ چ دبێژیت، مە تشتێن جوان یێن بو ئینایین ئەو یێ چ دبێژیت "
بیل – من بەحسا وانا نینە، بەلێ دێ بو خو چ بێژی ؟
فاغن – بێی من بوو، ئەز نەشێم ئەگەرا بو تە بێژم، باوەر بکە، ب شەرەفا خو .
بیل – تە شەرەف هەیە ؟، ئێك بو من گوشتی ببڕیت .
فاغن – تورە نەبە، دێ تە چەوا ژ بیر کەم ؟، بەلێ من هزر کر پ شڕتی مە ئولیڤەر هێلای ل وێرێ، نە باشە ئەم ل لەندەن بمینین .
یل – ئەرێ، ئەگەر ئەڤ کچکە نەبا دا مرم .
فاغن – بیل، ئەگەر کچك نەبا ها . ئەرێ نە فاغن بوو، ئەڤ کچکە بو تە دیتی؟
نانسی – ڕاست دبێژیت، بیل، ژێ تورە نەبە .
فاغن – بیل، دڤێت ئەم ئولیڤەری بزڤڕینن، ئەو بو من هندی جیهانەکێ یە .
بیل – دێ چەوا زڤڕینن .
فاغن – ئولیڤەر یێ ل دەڤ مەتا روز مێیلیێ، نوکە بو من شانسەك یێ هەی، یێن هاتین لەندەن، یێن ل ئوتێلەکێ، کا دێ نانسی هاریکاریا مە کەت، نانسی تو جەندا بێ رەنگی !
نانسیێ چاڤێن خو ب دەستێ خو گرتن "بێ رەنگ ؟"
ئەرێ، تە چ ل خو کریە ؟
چ نە، ئەڤە چەند حەفتیە، ئەز روینشتی .
سایکس – نوکە دەرکەڤە .
ئەز پێدڤی پارا مە، لگەل فاغنی هەڕە پارا وەربگرە، دێ ئەز ژی نڤم .
فاغن – من پارە نینن .
بیل – تە یێن هەین .
فاغنی دەستێ خو دانان سەر ئێك گازی کر "گەلەك، نەخێر وە نینە ؟ "

- ئەز نزانم كا تە جەند پارە هەنە، ئەز دشێم بێژم تو ژی نزانی، چونكی هژمارتنا وانا ب زەحمەتە، بەلێ ئەڤ شەڤە ئەز پێدڤی پارا مە، نە ئاخڤە، نانسیێ لگەل خو ببە، دا پارا بینیت .
ب دلێ فاغنی نەبوو، بەلێ نەچار بوو، لگەل نانسیێ دەركەفتن، دەمی چوووین مال فاغنی گوت "نوكە، دێ چم بو تە پارا ئینم، نانسی، كلیل یا ل دەڤ من، ئەز پارێن خو ناڤەشێرم، چونكی من پارە نینن ئەز ڤەشێرم، كەس سوپاسیا من ناكەت، كلیل كرە د بەریكا خو دا "نە ئاخڤە "
- كی یە ؟ گوهێ خو بدیێ . ژ دەرێجا دەنگێ زەلامەكی هات .
فاغن (ب دەنگەكێ نزم ڤە)-، ئەڤە ئەو زەلامە یێ ئەز ل هێڤیی، بەحسێ پارا ل دەڤ وی نەكە، نانسی ! دێ زوی چیت .
فاغنی شەمالكەك ڕاكر و چوو بەر دەرگەهی، مونكس بوو، دەمی نانسی دیتی پاش ڤە چوو .
فاغن – ئەڤە ئێكە ژ گەنجێن من . نەلڤە، نانسی، مونكس وەرە ژوور . فاغن :
چەوانی ؟
سوپاس .
باشی ژی .
ڤێ جارێ من لەز كر، دێ ل گەل یا تە ئاخڤم .
فاغنی ئەو برە ژوورا دی تر، نانسیێ پێلاڤا خو ژ پێ خو كر و ل دویڤ وان دجوو، چوو بەر دەرگەهی، بێی وانا، گوهی خو دا وانا، پشتی چەندەكێ نانسی زڤڕی ڤە، مونكس دەركەفت،فاغن زڤڕی ڤە .فاغنی گوت نانسیێ "نانسی، تو پشت ڕاستی، تو یا نەخوش"
ئەز باشم، پارا بدە من دا بچم .
نانسی دگری، بەلێ فاغنی ئەو نەدیت، ئەو پارێن بد ەتە سایكسی هژمارتن و دانە نانسیێ، نانسی بلەز ژ خانی دەركەفت .

## پشکا هەژدێ

## سەرەدانەک بو روز مەیلیێ

ل روژا پاشتر . بیل سایکس باشتر ببوو، نانسی دەرکەفتبوو هندەك خوارنێ بکڕیت، سایکسی مەی ڤەدخوار، وێ شەڤێ گوتە نانسیێ، "تو یا نەخوشی، دێ تە گهورم، تو ژی خو نە نیاسی، پشتی دەمەکی سایکس نڤست، نانسیێ گوت "سوپاس بو خودێ، دا ئەز بچم، دێ بیتە درەنگ "، دەرکەفت و ل جاددەیێن لەندەن بلەز چووو د ترسیا، دەمێ بووی دەمژمێر دەهـ نانسی ل ئوتێلەکێ بوو، ئێکی پرسیار کر "تو ل ڤێرێ چ دکەی؟"، دەمێ دیتی ک چك یا بێ سەروبەر و جلکێن کەڤن یێن ل بەر .

ئەز یا ل خانمەکێ دگەڕم .

خانمەك ؟

خانم مێلیێ .

بێژمێ کی یە ؟

پێدڤی ناکەت، ناڤی بێژم .

تو کارێ خو ژی نابێژی ؟

نەخێر .

زەلامی نانسی پا ڵدا، گوتێ "کەس ل ڤێرێ نینە، ژ ڤێرێ هەڕە "، نانسیێ ب دەنگەك بلند ڤە گوت " دێ من ڕاکێشن ژ ڤێرێ، یان ئەز ناچم"، کەس نینە بێژی تە خانم مێلیێ . خزمەتکارەکی دلێ وی ما پێڤە گوتێ"ئەز دێ بێژمێ "، نانسیێ گوت "بێژیێ، کچکەك دڤێت لگەل تە ب ئاخڤیت، بێژیێ گرنگە " . خزمەتکار چوو سەری، پاش هاتە خوارێ و داخواز ژ نانسیێ کر لگەل بچیت، چوونە ژوورەکا بچویك، روز مێیلیی ل وێرێ بوو .

روزێ گوتی " ئەز ئەوم یا تە دڤێت لگەل ب ئاخڤی، کەرەمکە " ، نانسی کاریگەر بوو، گری، "خانم، ئەگەر یێن وەکی تە گەلەك بان، دا یێن وەکی من کێم بن "

روینە خوار، ئەگەر تە دەردەك هەبیت، دێ هاریکاریا تە کەم، کەرەمکە ڕوینە خوار .

بهیلە ئەز ژ پیاڤە بم . ئەڤ دەرگەهە گرتی یە؟ .

ئەرێ، تە بوچی پرسیار کر ؟

چونکی دێ ژیانا خو و ژیانا هندەکێن دی کەمە د دەستێن تە دا، وێ شەڤێ ئەز بووم من ئولیڤەر ژ مالا بڕانلوی بری بو فاغنی .

تو !

ئەرێ، خانم، ئەو ئەز دڕندە بووم، یا دناڤ دزیکەرا دا دژیت ، ئەز چ جارا ب خوشی نەژیایمە .

دلێ من ئێ ب تەڤە، بو من بێژە .

خودێ تە دلخوش کەت، تو یا باشی، تو بزانی ئەز چەوا دژیم، دێ دلێ تە ب من سوژیت، ئەز یا ژ دەڤ هندەك زەلاما دهێم، بزانن دێ من کوژن، بەلێ ئەز یا هاتیم بو تە تشتەکی بێژم، تو مونکسی دنیاسی ؟

نەخێر .

ئەو تە دنیاسیت، دزانیت تو یا ل ڤێرێ، ژ بەر هندێ ئەز هاتم ڤێرێ .

من ئەڤ ناڤە گوهـ لی نەبوویە .

بەلكی ناڤەك دی هەبیت، من ئەڤ هزرە دكر، شەڤێدی دەمێ ئەو و ڤاغن ئاخفتین من های ژێ هەبوو، دزانن ئولیڤەر یێ ل ڤێرێ، یێ پلانا دكەن دا وی ببەن ڤە. دا دزیا پێ بدەن كرن .
ژ بەر چ ؟
ئەز ژی باش تێناگەهم، ب زەحمەت بوو ئەز گوهێ خو بدەمێ، مونكسی گوتە ڤاغنی " دەربارەی دایك بوونا ئولیڤەری یا ل بنێ رویباری، پاش بەحسێ وە رگرتنا پارا دكر .
ئەڤە چ نە ؟
ئەگەر ئەز ژی بێژم ئەڤە راستە، خانم، مونكسی دڤێت، ڤاغنی د زیا ب ئولیڤەری بدەتە كرن و ئێكی بكوژیت، ب ڤی رەنگی دێ زاروك مریت، مونكسی گوت " دێ ئەڤە بیتە دویماهیا برایێ من ئولیڤەری "
(ب دەنگێ بلند)، برایێ وی ؟
ئەڤە ئاخفتنێن مونكسی بوون، خانم، دێ بیتە درەنگ، دڤێت ئەز بزڤڕم .
نەچە، بمینە ل ڤێرێ، دێ دلخوش بی، بوچی ئەم نابێژین پولیسا .
دڤێت ئەز بچم، خانم، ئەز حەز ژ ئێكی دكەم، ئەز وی ناهێلم .
دێ ئەز چ كەم ؟
تو بێژە كەسەكێ تە باوەری پێ هەبیت، دڤێت ئولیڤەر بهێتە پاراستن .
دێ تە ل كیڤە بینم ؟
دێ سوزێ دەیە من، بتنێ تو و ئەو كەسە بهێن یێ تو بێژیێ ؟
ئەرێ .
ئەگەر ئەز مام ساخ، ل شەڤێن ئێكشەمبیا ل دەمژمێر یازدێ بو دوازدێ، ئەز یا ل سەر پرا لەندەن . نوكە ب خاتراتە، خانما هێژا .
ڕاوەستە، بوی دێ چی؟، ئەز دێ تە رزگار كەم، نەچە دگەل دزیكەرا، هێڤی دكەم، نەچە، دێ ئەز هاریكاریا تە كەم، یان ژی چ نەبیت، هندەك پارا وەربگرە، دێ بیتە هاریكار بو تە تو ژیانەكا باش ببورینی .
نانسیێ بگری ڤە، گوت "ئەز ناوەرگرم، خوزی تە نوكە ئەز كوشتبام، دا مەزنترین باشیێ لگەل من كەی، ئەز ە ەژی چ نینم، خودێ تە دلخوش بكەت، نانسی دەركەفت، ب گری ڤە .

## پشکا نوزدێ

## هەڤدیتنا هەڤالێن کەڤن

ئولیڤەری گوتە روزێ "ئەم یێن ل لەندەن، بچین برانلوی ببینین"، ژ بەری هینگێ بو بەحسێ برانلوی و خانم بێدوینێ کربوون، کا چەند بوو وی باش بوون، ئەڤە چەندە دڤیا ڤان کەسا ببینیت،روزێ بریار دا، بچیتە دەڤ برانلوی و ئەو تشتێن نانسیێ گوتینێ، بو بێژیت، لگەل ئولیڤەری چوون مالا وی، دەمێ چووین روزێ کارتا خو لگەل خزمەتکارەکی ڤرێکر و داخواز کر برانلوی ببینیت، بو کارەکێ فەر . خزمەتکاری گوت روزێ وەرە ژوور، روزێ ئولیڤەر لگەل گیلزی هێلا د ترومبێلێ دا و چوو ژوور، دوو زەلام دیتن ئێك ژ وانا رەوشەنبیر یێ دی نە، روزێ بەرێ خو دا وانا "بەڕێز برانلو ؟"، یێ رەوشەنبیر گوت "ئەزم، ئەڤە ژی هەڤالێ من بەرێز گریمویگە، گریمویگ دێ شێی مە بهێلی بتنێ ؟" ، هات بیرا روزێ دەمێ ئولیڤەری بەحسا گریمویگی کری، "پێدڤی ناکەر بەرێز دەرکەڤیت ، ئەز دزانم، دێ زانیت کا دێ بەحسا چ کەین" گریمویگی خو چەماند و سلاڤ کرێ .

روز – یا ئەز دبێژم، یێ هەوە شاش کەت، هەوە دەمەکی باشیەکا گەلەك مەزن، یا ل هەڤالەکێ من یێ بچویك کری، بێ گومان دێ هەوە دلخوش کەت، ئەز بەحسا وی بکەم، ناڤێ وی ئولیڤەر تویستە .

برانلو – راست، (هەر دوو حێبەتی ببوون ) . ئەز دترسم من هزرێن خراب دەربارەی ڤی زاروکی کربێ .

گریمویگ – ئەو زاروکەك خرابە، ئەگەر وەسا نەبیت، دێ دەستێ خو برم .

روز – ئەو زاروکەك باشە، دلەك گەرم یێ هەی .

برانلو – دەربارەی ڤی زاروکێ ژار، بو مە هەمی تشتا بێژن، دلێ مە گەلەك یێ ل دویڤرا .

روزێ هەمی سەرهاتییێن ئولیڤەری بو گوتن، دیار کر ل ڤان هەیڤا مەزنترین نەخوشیا وی ئەوە برانلو نەدیتی .

برانلو – سوپاس بو خودێ، ئەڤە بو من دلخوشیەکا مەزنە، بەلێ خانم مێلیی، بو مە بێژە کا نوکە ل کیڤە یە؟تە بوچی نە ئینایە ؟

روز- یێ ل بەر دەرگەهی، د ترومبێلێ دا .

برانلو – دەرگەهی ؟،

بێی ئاخفتن دەرکەفت ژ ژوورێ، چوو خوار . دەمێ برانلو چووی، گریمویگ ڕابوو، چوو و هات، پاش لبەر روزێ راوەستیا و ئەو ماچێ کر، روز ترسیا، "نەترسە، ئەز هندی باپیرێ تەمە، تو کچەکا شرینی، ئەڤە هاتن ! " لگەل ئولیڤەری هاتن ژوور، گریمویگ ڕوینشت، وی دەمی بێدوین ژی هات ژوور، ئولیڤەری خو هاڤێت وێ، ژنکا پیر گازی دکر " زاروکی من یێ خوشتڤی، خودێ دوعایێن من قەبویل کرن،من دزانی دێ زڤری، تو ل کیڤە بووی ؟ "

دەمێ ئولیڤەر و بێدوین د ئاخفتن، برانلوی روز برە ژوورەکا دی تر، بابەتێ نانسیێ زانی .

برانلو – ئەڤە بابەتەکێ سەیرە، و هندی مە مونکسی نەدیتی، ئەم ناڤەروکێ نزانین .

روز – بتنێ دێ نانسی هاریکاریا مە کەت، هەتا ئێکشەمبێ، ئەم وێ نابینین، مەتا من دڤێت بچیت گوندی .

برانلو – دێ شێی ژ مەتا خو خوازی دوو سێ حەفتییێن دی تر بمینن ل لەندەن .

نەخێر، مە وەسا گوتبوو، دڤێت ئەز سوزا خو بجهـ بینم .
گەلەك باشە، ئێكشەمبێ ئەز و تو دێ چینە پرا لەندەن، دڤێت ئەم ژ ئولیڤەری ڤەشێرین .
ڕاستە .
نوکە دا بچین دەڤ وانا، دخوزم ژ بەری بچی ئوتێلێ تو چایەکا مە ڤەخوی .

## پشکا بیستێ

## ژڤانەک ل نیڤا شەڤێ

ل شەڤا ئێکشەمبێ، چەنگا دێرێ لێ ددا، سایکس و فاغن د ئاخفتن، پاش بێ دەنگ بوون دا گوهێ خو بدەن دێرێ، نانسیێ سەرێ خو ڕاکر، گوت " دەمژمێر یازدەیە"، سایکسی گوت "یا بووی نیڤا شەڤێ، شەڤەکا تاری و بێ دەنگە، شەڤەکا باشە بو کاری "

فاغن- مخابن مە بو ئەڤ شەڤە چ کار دروست نەکرینە .

سایکس – ئەرێ، ڕاستە، من دڤێت ئەز ئەڤ شەڤە کار بکەم،نانسی، ڤێ نیڤا شەڤێ دێ چی کیڤە ؟

دەمێ نانسیێ کومکێ خو ڕاکری دا دەرکەڤیت گوت "نە دویر "

ئەڤە بەرسڤ نینە، دێ چی کیڤە؟

من گوت نە دویر .

من ژی گوت کیڤە، تە های ژ من هەیە ؟

ئەز ژی نزانم .

ئەز دزانم، تو ناچی کیڤە .ڕوینە خوار .

ئەز باش نینم، من یا گوتی تە، دێ پیچەك دەرکەڤم .

ئەگەر تە بڤێت، سەرێ خو د پەنجەرێ دا بینە دەر .

من دڤێت دەرکەڤم .

"دێ باشە، تو نا دەرکەڤی"، ڕابوو جوو دەرگەهـ گرت و کومکێ نانسیێ ژ سەری کر و هاڤێت ، "نوکە ڕوینە خوار، باشە ؟"، نانسیێ بدەنگەکێ بلند گوت "ئەگەر تو هزر بکەی، دێ ب کومك دەرکەڤم، تو شاشی، بهێلە ئەز بچم سایکس نوکە "

نەخێر .

فاغن بێژە ڤی بلا بهێلیت، دێ بو وی باشتر بیت، تە های ژ من هەیە .

من یا های ژ تە هەی، ئەگەر من نیڤ خولەکا دی های ژ تە هەبیت، دێ سەی بەردەمە تە .

نانسی کەفتە سەر چوکە، گوت "بهێلە بچم، بیل، بتنێ بو دەمژمێرەکێ بهێلە "

سایکسی دەستێ وێ گرت، گوت "ئەڤە یا دین بووی ! ڕابە "

ئەز نا ڕابم، تا تو بهێلی دەرکەڤم، چ جارا !

سایکسی ئەو ڕاکر، هاڤێت سەر کورسیکەکێ، تا دەمژمێر دوازدێ نانسیێ هێڤی ژێ کرن، گازی دکر، پاش بێ دەنگ بوو .

سایکسی گوت فاغنی "کچکەکا سەیرە "

فاغن – من چ جارا وەسا نە دیتیە .

نانسیێ هزرێن خو دکرن، فاغنی گوت "بوچی وە دکەت ؟"

فاغنی هزرێن خو کرن "نانسی یا ژ سایکسی دلنەخوش بووی، نوکە هەڤالەك نوی دیتییە، بەلکی ئەز هەوڵ بدەم لگەل من کار بکەت، یان ژی ئەز سایکسی ژەهری بکەم، ئەز چارلی بێتسی، ل دویڤ وێ ڤرێکەم، دا بزانم دچیتە کیڤە ؟، پاش دەنگێ خو بلند کر " دا ەئز بچم، بیل، دێ ئێك بو من روناهیێ گریت "

بیلی گوت نانسیێ " بو ڕوناهیێ بگره تا دەرگەهی، دێ مخابن بیت ستویێ خو بشکێنیت "، نانسیێ د دەستی دا شەمالکەك لگەل زەلامێ پیر دەرکەفت، دەمێ چووین بەر دەرگەهی فاغنی گوت نانسیێ " تە چی یە ؟ "
نانسی – تە دڤێت تو چ بێژی ؟
ئەگەرێ ڤان تشتا چی یە ؟ ئەگەر سایکس بو تە نەباش بیت، تو ژی بوچی ؟....
فاغنی دەڤێ خو بر بەر گوهێ نانسیێ . نانسیێ گوت "ئانکو ؟"
-نوکە ژێ بگەرهە، دێ دیسا ئاخڤین، ئەز هەڤالێ تەمە، نانسی هەڤالەکێ ڕاستگو، ئەگەر وی تو تورە کری وەرە دەڤ من، تو من دنیاسی، مانە وەیە، نانسی ؟ . نانسی گرنژی " ئەز تە باش دنیاسم . ل پشت خو زڤڕی "شەڤ باش "
دیسا شەڤا ئێکشەمبێ، دێرێ لێدا ڤە، ل سەر پرا لەندەن دوو کەس دیار بوون، ئێك نانسی، یێ دی یێ ڤەشارتی چارلی بێتس، پاش دوو کەسێن دی دیار بوون، خانمەکا گەنج و زەلامەکێ پیر .
نانسیێ گوتێ "ژ دەرێجا وەرن خوار، ئەز دترسم ل بەر چاڤێ هەرکەسەکێ لگەل هەوە ب ئاخڤم، هاتن دەڤ .
بڕانلو – هندە بەسە دویراتی، یا ەئز دزانم، ئێکشەمبیا دی تو نە هاتی ڤێرێ ؟
نانسی – ئەرێ، نەهێلا ئەز بهێم .
کێ ؟
ئەو کەسێ من بو خاتوین مێلیێ گوتی، دا ئەز بهێم دەڤ خانم مێلیێ من مەی دابوو وی .
ئەو نڤستی بوو دەمی تو هاتی ؟
نەخێر، ئەو چ نزانن دەربارەی ڤی بابەتی .
باشە، نوکە، دڤێت ئەم مونکسی بگرین و بزانین کا چ دڤێت، پاش فاغن بهێتە دەستەسەر کرن، هندی ئەو ئازاد ئولیڤەر ناهێتە پاراستن .
ئەز نەشێم وە بکەم . چ جارا، فاغن شەیتانە، خرابترە ژی، بو من .
بێژە کا ئەگەر چی یە .
خاتوینا مێلی ئەگەری دزانیت، ئەگەر پولیسا فاغن بر، دێ بیل سایکسی ژی بەن، ئەز حەز ژ وی دکەم .
ئەگەر وەسا بیت، مونکسی بدەنە مە، ئەم ژی بێی تە چ ل فاغنی ناکەین، هەمی تشتا دەربارەی مونکسی بێژە مە .
نانسیێ بو گوت "بەژن درێژ، گەنجە، دژیێ بیست و هەشت سالیێ دا، رەفتارێن سەیر یێن ل دەڤ هندەك دەما، تو بوچی هندە حێبەتی بووی بەرێز برانلو ؟"
- چ نە، زەحمەت نەبیت، بەردەوام بە .
- جلکێن رەش یێن ل بەر، ل ستویێ وی ....
- نیشانەکا سور هەیە، ل ستویێ وی ؟
- ئەڤە چی یە، تو دنیاسی ؟
- ب هزرا من ئەز دنیاسم، بەلکی ئەو نەبیت .
بڕانلو کەفتە د هزرا دا، پاش د دلێ خو دا گوت " دبیت ئەو بیت"، دەست هاڤێت بەریکا خو دا پارا دەتە نانسیێ . نانسیێ گوت "من ئەڤە بو پارا نەکر، من ژ بەر ئولیڤەری ڤێ خانما شرین کر "

روز – هێڤی دکەم، ڤان پارا وەربگرە، دێ ب کێر تە هێت، د تەنگاڤیا دا .
نانسی – خودێ هەوە دلخوش بکەت، دا ئەز بچم، شەڤا هەوە بمینیت خوش .
نانسی ژ وێرێ چوو، روز و برانلو ژی ژ وێرێ دویر کەفتن، چارلی بلەز دچوو مالا فاغنی .

## پشكا بیست و ئێكێ

## مرنا نانسیێ

دوو دەمژمێر مابوو ن بو دەركەفتنا روژێ، فاغن روینشتی بوو ل ژوورا خو، چاڤێن وی سور ببوون، هەروەكی ژ مەزاری دەركەفتی، بەرێ خو د شەمالكا ل سەر مێزێ، نینوكێن خو دخوارن، چارلی نڤستی بوو،فاغنی هزرێن خراب دكرن، كەربێن وی ژ نانسیێ ڤەدبوون یا لگەل بیانیا ئاخفتی، ترسا مرنێ، پلانێن وی یێن د بەر ئاڤێ دا بچن، هەتا گوهـ ل دەنگەكی بووی ل جاددێ بێ دەنگ بوو،گوت "ل دویماهیێ"، دەرگەهـ ڤەكر و لگەل بیل سایكس زڤری ژوور، سایكسی كارتونا د دەستی دا دانا سەر مێزێ،گوت"ئەڤەیە، من كێم نەخوشی نە برینە تا من وەرگرتی، پولیسا دووكینسێ گرتی نوكە یێ د زیندانێ ڤە"، فاغنی بەرێ خو ددا سایكسی .

سایكس – چ چێدبیت، تو بوجی وەسا بەرێ خو ددەیە من ؟

فاغنی دەستێ خو ڕاكر، لێ نە ئاخفت .

سایكس – یان ژی تو ژی ژی دین بووی ؟

فاغن – نە،نە، بیل،تو ئەو مروڤە نینی،یێ ئەز هزر دكەم، بەلێ دڤێت ئەز تشتەكی بو تە بێژم.

سایكس- دێ بێژی، بلەز، یان ژی دێ نانسی هزر كەت ئەز یێ بەرزە بوویم .

فاغن- بەرزە بوون؟، ئەو بخو وەسا هزر دكەت،بیل، خو هاڤێت سایكسی و ئەو هەژاند .

سایكسی ب حێبەتی ڤە بەرێ خو دا وی، پاش ستویێ وی گرت و ئەو هەژاند ،گوتێ "دێ ئاخڤی ؟،دەڤێ خو ڤەكە و بێژە كا دێ چ بێژی؟"

فاغنی گوت "دێ بێژین چارلی تشتەك كر "، سایكسی بەرێ خو دا چارلی یێ نڤستی، چ جارا وەسا بەرێ خو نەدابیێ .

ئێێێێ؟

هزر بكە، بەحسێ مە یێ بو هندەكا كری، ئەم چ دكەین، ل كیڤە نە، هزر بكە شەڤ بێی مە دەركەفت، گوتە هندەكا كا دێ مە ل كیڤە بینن،پولیس بهێن مە ببەن،كوركی ئەڤ هەمی تشتە كرن، دا چ لێ كەی ؟

سایكسی ب دەنگەكێ زێدە ترس ڤە گوت "دێ چ لێ هێت؟، ئەگەر ئەز بام دا چم سەرێ وی كەمە د بێ سولا خو ڤە پارچە پارچە كەم، دا كوژم "

پا ئەگەر من وە كربا ؟

دا سەرێ تە ژی پارچە پارچە كەم.

دا وەكەی ؟

ئەرێ، تە بڤێت بجەربینە .

پا ئەگەر توبی،بێت،یان ژی دووكیسن ؟

سایكسی گوت " كی بیت،ئەز نا بەرێ خو دەمی كا كی یە؟،فاغنی رەق بەرێ خو دا بیلی، زڤری بو چارلی یێ نڤستی، ئەو ژ خەو ڕاكر، گوت "ژارێ چارلی، یێ وەستیای، هندی جاڤدێریا كری، بیل"،سایكسی گوت"تە دڤێت تو چ بێژی ؟

فاغن نە ئاخفت، فاغنی بەری خو دا سایكسی گوت چا رلی "وان تشتا بو بێژە یێن تە بو من گوتین، دا ئەو ژی گوهـ لێ ببیت "

هێشتا جارلی نیڤ نڤستی بوو،گوت"چ بێژم؟"،فاغنی گوت "هەمی تشتا"دەستێ سایکسی گرت "نانسی، تە جاڤدێریا وێ نەکر؟
بەلێ .
تا پرا لەندەن، مانە وەیە ؟
ئەرێ .
نانسی لگەل دوو کەسا ئاخفت مانە ؟
ڕاستە .
ژنکەك و زەلامەك بوون،پرسیارا مونکسی ژێ کر،دزانی کا دێ مە ل کیڤە بینن، هەمی تشت بو وانا گوتێ،مانە وەیە؟فاغن گەلەك توڕە ببوو .
بەلێ، وەیە .
بێژە، کا چ بەحسا ئێکشەمبیا بوری کرن .
پرسیار کرن کا بوچی ئێکشەمبیا بوری نانسی نەچوو ؟
بێژە کا بوچی ؟
چونکی بیلی نەهێلا ئەو بچیت، ئەوێ ژ بەری نوکە بو بەحس کری .
سایکسی دەستێ خو ژ دەستێ فاغنی ئینا دەر و گازی کر " من بەردەن، دا بچم"، ژ ژوور دەرکەفت، فاغن ل دویڤ چوو، "بیل، بیل، سوزێ بدە من تو گەلەك نە ئێشینی، سایکسی نە ئاخفت بلەخ چوو بو مالا خو، . دەمێ چووی مال، چوو ژوورا خو، دەرگەهـ ل پشت خو گرت و مێزەك مەزن دا پشت . گوت "ڕابە !"
نانسیێ هەر وەکی ب دلێ بو وێ هاتی، گوت "تو یی بیل؟"
ئەزم ڕابە .
نانسیێ ژ ترسا گوت "تو بوچی وەسا بەرێ خو ددەیە من ؟ "
سایکسی بەرێ خو دایێ،پاش پرچا وێ گرت و برە نیڤا ژوورێ،دەڤێ وێ گرت.
بیل،بیل،ئەز گازی ناکەم، لگەل من ب ئاخڤە !بێژە من چ کریە ؟
تو دزانی، چاڤدێرییا تە یا کری ئەڤ شەڤە،هەمی تشتێن تە گوتین یا گوهـ ل تە بووی .
نانسیێ دەستێ خو کرنە ستویێ بیلی گوت "کا جەوا من تو پاراستی، تو ژی من نەکوژە، بیل تو دل نادەی من بکوژی،هزرێن خو بکە کا من بو تە چ کریە ؟باوەر بکە ئەز ڕاست دبێژم "،
سایکسی نەدشیا خو ژ دەستێن نانسیێ بینیتو دەر . نانسیێ گوت "بیل، دێ ئەو کەسە هاریکاریا مە کەن، پارە دانە من،وەرە دا ئەز و تو ژ ڤێرێ بچین،ژیانەکا نوی بو خو ئاڤا بکەین، درەنگ نینە بو مە،سایکسی دەستەکێ خو ئینا دەر و چەك ئینا دەر، تەقە ل وی ڕوییێ ل بەرامبەر خو کر، جارەکا دی ژی تەقە کر، نانسی کەفت،هەروەکی کورە ببوو، ژ سەرێ وێ خوین دهات،کەفتە سەر چوکا و دوعا ژ خودێ کرن . دیتنەکا ترس بوو،سایکس پاش ڤە چوو،پشتا خو دا دیواری، دا نەبینیت دارەك ل نانسیێ دا و ئێخست ئەردی .

## پشکا بیست و دووێ

## سایکس دڕەڤیت

روژ دەرکەفت، ژوورا نانسی تێڤە روناهی هاتێ، سایکسی جلکێن خو شویشت بوون و خو پاقژ کربوو، بەلێ هندەك لەکە لسەر هەبوون ژێ نەدچوون، ئەو پارچە ژێڤ ەکرن و سوتن، ئەرد ببوو خوین، پێن سەی ژی خوین پێڤە بوون . لگەل سەی دەرکـەفت ژ دەرڤە، ژ مال دویرکەفت، چوو رێکا گوندەکی پاش نڤست، بوو شەڤ، سایکس بەردەوام بوو لسەر ڕێکا خو، وەستیا، سەیێ وی برێڤە نەدچوو، چوو د خوا رنگەهەکێ ڤە، داخوازا خوارنێ کر، پێن ل وێرێ سایکس نەدیت،کەسەك هاتە ژوور،دا سایکس نڤیت، ئەو کەسە فروشیارێ کەل و پەلێن پاقژکرنێ بوو، ئێکی گوت"هێری، چ د خەزینا تە دا هەیە، خوارنکەك تشتەك؟"،هێری گوت" تشتێن ب مفا پێن هەین، ئەڤە تشتەکە هەمی لەکا (پیساتیا) ژ جلکا دئینیت دەر،ئەرزانن"، هندەکا ئەو بەرهەمە ژی کرین، هێری گازی دکر "هەمی لەکا دئینیت دەر، بەرێ خو بدەنێ لسەر کومکێ ڤی بەرێزی، لەکەیەك یا هەی،دێ نوکە ئینم دە ر "، سایکسی گازی کر"نەنە"،هێری گوت "دێ پاقژ کەم، ئەزبەنی، بەرێ خو بدەنێ چای، فێقی، ئاڤ، بویاغ، یان ژی خوین....

سایکسی نەهێلا زێدەتر ب ئاخڤیت،کومکێ خو ژ دەستی دا ئینا دەر و دەرکەفت ،دەمێ دەرکەفتی، ترومبێلا پوستا دیت،چوو دەڤ خانیێ پوستەخانێ، سایکس نێزیك بوو، گوهـ ل ئاخفتنێن پولیسی بوو، پێن بو کارم ەندێ پوستێ دگوتن،" ئەڤە نامە ، چانتە ژی ئەڤە یە،نوکە لەزێ بکە بو دابەشکرنا نامەیێن ژ لەندەن هاتین، باشە،تو گیرو دبی !،دەمێ پولیسی نامە داینێ، "بو لەندەن تشتەك نوی هەیە؟ "

یێ بەحسا کوشتنەکێ دکەن، کوشتنەکا دڕندە .

زەلامە یان ژنك .

ژنك، ئێکا گەنج، ئەز هەتا سپێدێ نا ئاخڤم، بخێر بچی .

ترومبێل دویر کەفت، سایکس بەردەوام بوو، دتر سیا، ئەو تشتێن د رێکـێ دا دیتین، دار و بەر، ل بەر دبوون رح، یان ژی کەلەخەك، هەروەکی ژ هەمی جها خوین دهات، پاش هزر کر نانسی یا ل دویڤ ڤە، چاڤێن وێ ددیتن، د دلێ خو دا گوت " ئەز نەشێم، شەڤەکا دی ژی ل ناڤ دارستانێ بم، دێ زڤرم لەندەن، چەوا بیت، ئێك یێ ل وێرێ هەی، ئەز لگەل ب ئاخڤم، پولیس ژی هزر ناکەن، ئەز دێ مینم ل لەندەن، دێ حەفتیەکێ مینم ل وێرێ، پاش دێ چم فرەنسا، فاغن دێ هاریکاریا من کەت، دێ جەڕبینم"،خو ئامادە کر دا بزڤریت،بڕیار دا نیڤا شەڤێ بزڤریت لەندەن، پاشی گوت "ئەڤ سەیە، دێ پولیس زانن،سەیێ لگەل من، دێ خەلك من نیاسن"،سایکسی بریار دا سەی بخەندقینیت د ڕوبیاری دا، بر دەڤ روبیارەکێ بچویك،بەرەك ڕاکر و کرە د ناڤ دەستمالەکێ دا،سەی بەرێ خو دا خودانی خو،سە لگەل وی نەچوو، بنێ ڕوبیاری .

سایکس – وەرە ڤێرێ، تە های ژ من نینە ؟

سە پێش ڤە چوو، پاش زڤری ڤە.

وەرە ڤێرێ،سە ڕاوەستیا، پاش ڕەڤی ب هەمی لەزاتیا خو،سایکسی گازی کرێ، پاش ڕوینشت ما لهێڤیا سەی، پاش نەچار بوو بتنێ بەردەوام بیت ل سەر ڕێڤنگیا خو .

## پشكا بيست و سيێ

## دەستەسەر كرنا مونكسى

دەمێ برانلو زڤڕى مالا خو، نيڤەكا شەڤێ بوو، دوو خزمەتكار هاتن كەسەك دى ژ ترومبێلا ئينان دەر و برنە ژوور، ئەڤە مونكس بوو ، دەمێ روينشتين برانلوى گوت "نوكە، مە تشتەك يێ هەين ئەم باخڤين "، مونكسى گوت "هەوە چەوا ئەز ئينام ڤێرێ، تو باشترين هەڤالێ بابێ من بووى تە چەوا ئەز ئينام ؟"
چونكى ئەز هەڤالێ بابێ تە يێ كەڤنم، من دڤێت ئەز لگەل تە ب ئاخڤم . هەڤالينيا بابێ تە و خويشكا وى، ئەو ڤيانا من بو مەتا تە هەى، من نەچار دكەت، ئەز لگەل تە ب ئاخڤم، من دڤيا ئەو ببيتە هەڤژينا من، بەلێ مخابن د ژيێ بچويك دا مر، ئێدوارد ليفورد .
تە چ پەيوەندى ب ڤى ناڤى ڤە هەيە ؟ دەمەكى ناڤێ من بوو، بەلێ من يێ گوهارتى .
كەيفا من هات تە گوهارتى، دەمەكى ناڤێ مەتا تە ژى بوو، من ژ بير نەكريە .
تە چ ژ من دڤێت ؟
تە برايەك يێ هەى .
من چ برا نينن، تو د زانى ئەز ئێكانەمە .
گوهێ خو بدە من، ئەز هەمى ڕابردوويێ خێزانا تە دزانم . هەڤژينيا بابێ تە يا دل نەخوش، ژێكڤەبوونا دەيك و بابێن تە، بابێ تە وى دەمى گەنج بوو، هەڤالێن نوى بو خو پەيدا كرن، بو نموونە زەلامەكى دوو كچ هەبوون،ئێك نوزدە سالى، يا دى هێشتا زاروك .
من چ پەيوەندى لگەل هەيە ؟
دەمێ بابێ تە نوزدە سالى، ئەڤينداری كچەكێ ببوو ، ب راستى نەخوش بوو، بابێ تە دەولەمەند بوو، گەلەك ميرات هێلابوو، پاش بابێ تە مر و هەمى مالێ خو هێلا بو هەڤژينا خو يا ژ وى دوير و زاروكێن خو ئانكو هەوە .
ئێێ؟ ئەڤەبوو يا تو بێژى ؟
نەخێر، بابێ تە ژ بەرى بمريت هاتبوو دەڤ من .
ئەز ڤێ چەندێ نزانم .
بەلێ، ژ بلى هندەك تشتا وێنەيێ وێ كچكێ ژى داڤ من، وى ئەو تابلويە چێكربوو، وى ڤيا ئەز وێنەى ب پارێزم، دا وێ كچكێ ژى لگەل خو بەت، پاش مر، پشتى مرنا وى، ئەز چووم دا كچكێ ببينم، بەلێ چوبوو، من چ جارا نەديت، پشتى هينگێ ل مالا بێ هێزا زاروكەك ببوو، ئەو زاروكە برايێ تە يە، ئوليڤەر تويستە، تا من ئوليڤەر ئيناى مالا خو من نەدزانى .
مونكسى گازى كر "چ ؟"
ئەرێ، ئوليڤەر دەمەكى ما ل دەڤ من، من نەدزانى كى يە ؟، پاش من ديت گەلەك وەكى وێنەيێ تابلويێ يە، بو من بوو مەرەق كا ژ كيڤە هاتيە؟، بەلێ دويڤدا پيدڤى ناكەت كا چەوا، ئوليڤەر هاتە ڕەڤاندن ؟
من ئاگەهـ ژ ڤان تشتا نينە .
دێ بينين، زاروك بەرز ە ببوو، دەيكا وى نينە، من هزر كر تو دێ هاريكاريا مە كەى .ئەز گەلەك ل تە گەڕيام .

و نوکه ته ئەز دیتم مانه وەیه ؟، چ بەلگه د دەستێ ته دا نینن، ب تنێ تو هزر دکەی، ئولیڤەر وەکی یا د وێنەی دابو، تو نزانی کا ئەو کچکا د وێنەی دا زاروك بوویه یان نه .
ئەز نزانم، بەلێ د ڤان حەفتیادا من تشتەك زانی، ته برایەك یێ هەی، تو ژی ڤێ چەندێ دزانی، بابێ ته نامەیەك بو مه ڤرێکربوو، دەیکا ته ئەو ژناڤبر،د نامێ دا بەحسێ وان پارا دکر یێن بهێنه هێلان بو ئولیڤەری .
چ جارا ئەڤ تشته چێنەبوویه .
برانلوی گوت "ئەز هەمی تشا دزانم، ته هەمی خرابی جەرباندن دا ئولیڤەری ژ ناڤ ببەی، ته نه گوت ڤاغنی، هەمی تشت یێن ل بنێ رویباری یێ هاریکاریا ئولیڤەر بکەت؟، دێ بێژی ئەڤه وه نینه،( مونکس نه ئاخفت) . ئەز نابێژم پولیسا، دێ هاریکاریا ئولیڤەری کەی دا بارا خو ژ پارا وەربگریت، دێ هندەك لاپەرا دەمه ته دا تو ئیمزا کەی، پاش هەره، دێ ڤەبویل کەی ؟ "، مونکسی نەدزانی دێ چکەت، هات و چوو ل ژوور، پاش دەرگەه - ڤەبوو، و گریمویگ هاته ژوور .
هەوە ئاگەهـ ژ کوشتنێ هەیه ؟، هزر دکەن دێ ئەڤ شەڤه وی گرن، سەیێ وی یێ دیتی، یێ بگریت، دێ دەهـ هزار لیرا دەنێ .
برانلو –پێنج ژ من ژی، ئەو ل کیڤه یه؟
گریمویگ – هێشتا نه گرتیه، بەلێ دێ گرن، هەمی کەس ڤێ باوەر دکەن.ب هزرا من دێ وی ڤێ حەفتییێ گرن .
مونکسی ب ترسەکا مەزن بەرێ خو دا هەردوو زەلاما، گریمویگی گوت "بامبل یێ هاتی، دێ نوکه وی بینن؟"برانلوی گوت " ئەرێ، نوکه"، بەرێ خو دا مونکسی، ب دەنگەکێ نزم ڤه گوت "ته بریار دا، دێ ڤەبویل کەی ؟ "
مونکس – ئەرێ، دێ ڤەبویل کەم، تو ژی ڤان تشتا نابێژی کەسێ ؟ .
ئەرێ، نوکه نەمینه ل ڤێرێ، هەره .
گریمویگی بامبل ئینا ژوور ڤه، بامبلی گوت برانلوی " دلخوش بووم ب دیتنا ته، ئەزبەنی " ئولیڤەرێ مه یێ خوشتڤی چەوانه ؟، من هەردەم وەکی زاروکی خو حەز ژ وی دکر .
برانلوی مونکس نیشا کر گوت "تو ڤی دنیاسی، بەێز بامبل ؟"
نەخێر .
تو ژ ڤێ چەندێ پشڕت ڕاستی ؟
بەلێ .
بەلکی ته مەدالیا زێرێ ژی نەدیتیه، یا ژنکا پیر ڤەشارتی ؟
من نەدیتیه،یان ژی هەوە ئەز ئینایمه ڤێرێ،دا ڤان پرسیارێن بێ سەروبەر ژ من بکەن؟
بامبل پێدڤی ناکەت، تو وەسا بەردەوام بی،مونکسی هەمی تشت بو مه گوتن .
دڤیا بامبل هەمی ڕاستیا بێژیت، گوت "دێ باشه،من پیچەك پاره ژ ڤی زەلامی وەرگرتن، گوستیرك و مەدالی یێن ل جهەك وەسا، هوین چ جارا وەرنەگرن، تشتەك دی هەیه ؟
برانلوی گوت "نەخێر، بتنێ ئەڤه هندێ دیار دکەت، تو زەلام ەك ڕاستگوی، بو هندێ باش نینی، ببەی رێڤەبەرێ مالا بێ هێزا، دێ هەوڵ دەین ته ژ وێرێ کەین دەر، بخێر بچی "

## پشكا بیست و چواری

## مرنا سایكسی

ل گزیرتەیا یەعقوبی تەیمیزێ،پیسترین و هەژارترین گەرەك یا لێ، مالێن ل وێرێ هەرفتی و كەڤنن، توبی كرێكت و چارلی بێتس ل مالەكێ ڤەبوون، خو ڤەدشارت، ب ترس ڤە د ئاخفتن توبی گوت "كەنگی ڤاغن هاتیە دەستەسەر كرن ؟ "

ئەڤ شەڤە، ل دەمێ خوارنێ . ئەز ژ بانی رەڤیم .

بێت ؟

ژارێ بێت، ئەو بر مال، دا بێژیت كەلەخ یێ كێ یە . وەكی دینا بوو، دگری، گازی دكر، سەرێ خو ل دیوارا ددا . برن نەخوشخانێ .

دێ فاغنی سێدارە كەن، سایكسی ژی، ئەز یێ دبێژم تە، چارلی ئەم یێ د مەترسیێ دا، كەس مە نابینیت ل ڤێرێ .

دەمێ ئەو وەسا د ئاخفتن، دەنگەك ژ دەرێجا هات، سەیێ سایكسی هاتە ژوور، توبی گوت "ئەڤە چی یە ؟، سایكسی ناهێت ڤێرێ، مانە وەیە، دخواز نەهێت .

چارلی – ئەگەر ڤیابا بهێت ڤێرێ، دا لگەل سەی هێت، راوەستە مهندەك ئاڤێ بدە ڤی سەیی، یێ ژ دویر هاتی .

ئاڤ دا سەیی، پاش چوو بن كورسیكەكێ و نڤست .

توبی – ب هزرا تە، سایكسی بەحسێ ڤی خانیێ بو كەسێ نەكریە مانە وەیە ؟ بچین ژ ڤێرێ، ئەز د پاراستنێ دا نینم .

چارلی – نەخێر .

سایكسی خو نەكوشتبیت .

دێ، ئەگەر خو كوشتبا، دا سە مە بیتە وی جهی یێ خو لێ كوستی، دیارە یێ ژ وەلاتی دەركەفتی .

تاری ببوو، شەمالكەك هەلكرن و دانان سەر مێزێ، گەلەك دترسیان، هەروەكی كەلەخێ نانسیێ یێ ل ژوورا وانا، پاش دەگەهـ هاتە لێدان، توبی د پەنجەرێ را بەرێ خو دایێ، سپی بوو، نەشیا بێژیت چارلی كا كی یە ؟، چوون بەر دەرگەهی، چارلی گوت "دڤێت ئەم وی ببنین ژوور، ما دێ چ كەین ؟"، سایكس هاتە ژوور، وەستیای و پیر ببوو، رهێن وی هاتبوون، روینشتن، بێ دەنگ بوون، پاش سایكسی ئاخفت .

ـ ئەڤ سەیە چەوا هاتە ڤێرێ ؟

چارلی گوت "ب تنێ، ژ بەری دوو دەمژمێرە "

روژنامێن ئەڤرو یێ دبێژن، فاغن یێ هاتی دەستەسەر كرنا راستە ؟

راستە .

دیسان بێ دەنگ بوون . سایسكی رویێ خو گەمراند، گوت "خودێ سزایێ هەوە هەردوویا بدەتە هەوە، چ تشت دی نەبوو هوین بێژن من"

هەر دوو زاروك نە ئاخفتن، "هەوە چ ل بەرە هوین بكەن، دێ من فرووسن پولیسا، یان ژی دێ هێلن تا دویماهیا هەیڤێ ل ڤێرێ بمینم، من بەرسڤ دڤێت "

**توبی – ئەگەر تو ل ڤێرێ بهێی پاراستن بمینە، دیسان بێ دەنگ بوون، پاش سایکس ئاخفت "کەلەخ ڤەشارتی یە ؟" زاروکا سەرێ خو ب نیتەا نەخێر هەژاند .**
**سایکسی گازی کر "بوچی نەهاتیە ڤەشارتن؟، بوچی تشتێن وەسا کرێت، بن ئاخ ناکەن ؟**
**جارلی گازی کرێ "شەیتان، ئەز ژ تە ناترسم "**
**توبی بەلکی بهێلیت تو ل ڤێرێ بمینی، بەلێ ئەز هاریکاریا تە ناکەم، سایکس جارلی ل ئەردی دا، چوکین خو دانان سەر ستویێ چارلی، دەرگەهـ هاتن قوتان، ژ دەرڤە روناهی و دەنگ هاتن . دگوتن "خو بدەست بدەن، دەرگەها ڤەکەن "**
**توبی سپی بوو ژ ترسا، گوت "یێن ل ڤێرێ، ئەم دیتین، سایکسی چارلی ل ئەردی راکر، گوت "نوکە ئەز ڤی کوری ببەم کیڤە، کرێکیت ؟" چارلی برە ژوورەکا ل خوارێ .**
**سایکسی گوت "دێ، چەوانە، گازی کرن، دێ نوکە زانی ؟"**
**کەسێن ژ دەرڤە گازی دکر هندەکا دگوت "دا خانی بسوژین "، هندەکین دی دگوت "سپێترکا بینن، دا بچین ژوورڤە "، هندەك هەوڵددا خو ل سەر دیوارا ڕا بهاڤێژن "**
**سایکسی گازی "ئاڤ، دەمێ ەئز دهاتیم ڤێرێ، ئاڤ ڕادبوون، وەریسەکی بدە من، یێ درێژ، دێ ئەز ل پشتا خونی ڕا دەرکەڤم، یان ژی دێ دوو کەسێن دی کوژم و پاش خو ژی کوژم "**
**توبی وەریسەکی دا ڤێ، سایکس ل بانی ڕا، بەرێ خو خوارێ، ئاڤ هاتبوو ڤەکێشان، دەمێ خەلکێ سایکسی دیتین، گازی کر، پاش دەنگ ژ ژوورڤە ژی هات، هاتوون ژوورڤە . سایکسی لایەك وەریسی، کرە د چوارچوڤێ بانی دا، یێ دی ب خو ڤە گرێدا، هزر دکر گوت "دەمێ ئەز دچم خوار، دێ وەریسی ژ خو ڤەکەم، پاش وەریسی بڕم "، هەر چەوا بیت کیر یا د دەستێ من دا، وی دەمی سایکس ل پشت خو زڤڕی، دەستێ خو هاڤیتن سەێ خو، ڤێریەك ترسێ ڤەدا، گازی دکر "دیسا ئەو چاڤن، ئەز یێ چاڤێن کچکێ دبینم "، سایکس پشت و پش ت کەفت ئەردی، وەریس مابوو ل ستویێ وی، دوازدە میترا کەفت، پاش ڕاوەستیا، مابوو هلاویستی،مر .**

## پشكا بيست و پيٚنجىٚ

## دويماهيا چيروكىٚ

فاغن ل ژوورا خو يا زيندانێ روينشتى بوو، هزرێن خو دكرن، پاش هندەك پەيڤێن دادڤانى هاتن بيرا وى " دێ وەريسى كەنە ستويێ وى، هەتا دمريت..."، كەسێن وەكى وى دهاتن بيرا وى، يێن وى كوشتين، هندى گەلەك بوون، نەدشيا بهژمێريت، ژ وانا ديتبوون دەمێ دمرين دوعا دكرن، ئەو پێ دكەنى، چ مرنەكا سەير بوو، ئەو كەسێن بهێز دەمى دهاتنە سێدارەدان دبوون گينيكێ جلكا، هندەك ژ وانا دبيت د ڤێ زنيدانێ دا بوون، هەست كر يێ د ژوورەكا تژى كەلەخ ڤە، ل دەرگەهى دا، گازى كر "روناهى، رِوناهى "، پاش كەسەك هات، د دەستێ وى دا شەمالكەك، شەڤ بورى ب بێ دەنگى پاش دەنگێ چەنگا دێرێ هات گوهێن وى ، ل هەر دەنگەكى دا، تشتەك دووبارە دبوو "مرن ! ". روژ دەركەفت، روژ ؟ روژ بو وى ئێدى نەبوون، پاش شەڤ هات، ئيدى ژ جياوازى بو وى نەبوو، دەمێ وى ب ترس و لەرزێ دبورى . ڤێ جارێ وەكى درِندەيەكى گازى كر، گرى، دوو كەس ژ زەلامێن ئاينێ وى هاتن بو دوعا بكەن، بەلێ فاغنى ئەو دەرئێخستن . بوو روژا دووشەمبێ، دويماهيك روژا فاغنى بوو، ل سەر تەختێ خو روينشتى بوو، پاش دوو كارمەندێن زيندانێ هاتن دەڤ، برانلو و ئوليڤەر ژى هاتبوون .

كارمەندەكى گوت برِانلوى "دێ ئەڤ بەرێزێ زاروك ژى چيتە ژوور، ئەزبەنى بو زاروكا وێرێ خرابە ديمەنەكێ ب ترسە ؟"، برِانلوى گوت " ئەز دزانم، بەلێ ئەو كارێ من لگەل وى زەلامى هەى، گرێدايە ب ڤى زاروكى ڤە، ئوليڤەرى ئەو زەلامە يێ ديتى، لگەل خرابيێن وى، ئەگەر ب من بيت، دڤێت ئەو ئەڤروكە وى ببينيت "، چوون ژوور .

فاغن- هوين هاتنە ڤێرێ چ ؟

برانلو – لگەل تە هندەك لاپەرێن يێن هەين، مونكسى يێن داينە تە، مە دڤێت بزانين كا ل كيڤەنە ؟

فاغنى گازى كر "ئەڤە درەوە، چ لاپەر ل دەڤ من نينن، خو ئێك ژى "

برانلو – وە نەبێژە، تو يێ ل بەر مرنێ، تو دزانى، سايكس مر و مونكسى هەمى تشت بو من گوتن، ل كيڤە نە ئەو لاپەرە، بێژە ؟

فاغن- ئوليڤەر وەرە ڤێرێ، دێ بو گوهێ تە بێژم . ئوليڤەرى ب دەنگێ نزم ڤە گوت "ئەز ناترسم "، دەستێ برانلوى بەردا و چوو دەڤ فاغنى . فاغنى گوت ئوليڤەرى "ئەو لاپەر، يێن ل ژوورا سەرى، يێن ل چانتەكى دا، ل سەر تەباخێ، من دڤێت ئەز ل گەل تە ب ئاخڤم، خوشتڤيێ من "

ئوليڤەرى گوت "ئەرێ،ئەرێ، بهێلە ئەز ل دەستپێكێ دوعا بكەم، هێڤى دكەم، بتنى دوعايەكێ، تو ژى بكەڤە سەر چوكا، لگەل من دوعا بكە "، فاغنى ئوليڤەر پاڵدا بو ژ دەرڤە گوت "ژ دەرڤە، ژ دەرڤە، دێ ل دەرڤە دوعا كەين، تو من ژ ڤێرێ دەربێخە، تو دێ شێى من دەرئێخى"، ئوليڤەر دەست ب گرى كر " خودايێ من ل ڤى زەلامى ببورە "، دەرگەهێ زيندانێ ڤەبوو . كارمەندا فاغن گرت، فاغن وەكى گيانەوەرەكى گازى كر، پاش ڤێريەك ڤەدا دەنگێ وى گەهشتە هەمى زيندانێ . برانلو و ئوليڤەر ژ زيندانێ دەركەفتن، چ نەما بوو دا دلێ ئوليڤەرى گريت، بو ڤێ سەرەدانا ب ترس، نەشيا ب رێڤە بچيت . ئەم هاتين دويماهيا چيروكا خو، ئەم دشين ب هندەك پەيڤێن سادە ب دويماهى بينين، پشتى مرنا فاغنى، جارلى بێتسى برِيار دا ژيانەكا باش و

ڕاست ببەته سەر، کارێن دزیێ هێلا  ن و ل دەڤ جوتیارەکی کار کر . مونکس چوو ئەمریکا، هەمی پارێن خو مەزاختن و ل زیندانێ  ڤە مر، برانلوی ئولیڤەر خودان کر، لگەل خانم بێدوینێ چوون گوندی، خانیێ وانا میلەکی ژ یێ خانم مێیلیێ و روزێ دویر بوو. گیلز و بریلتز، خزمەتکارێن خانم مێیلیێ، مان ل وێرێ، نوژدار لوزب  ێن دووباره زڤڕی چورتسی، ئەو ژی چوو گوندی پشتی دەمەکی . گریمویگ دەم دەم دهات سەرەدانا وانا ژ لەندەن . خوشیەکا مە  زن بوو ئولیڤەر ل  دەڤ هەمی هەڤالێن خو یێن باش ب ژیت .هەمی ژی دلخوش بوون و سوپاسیا خودێ دکرن ئەو خودایێ ئەو د پاراستن  و دلوڤانی ب وان دبر .

دوماهی



Translated
Rojhat Saeed

# Oliver Twist

By Charles Dickens